المعهد العالمي للفكر الإسلامي

(١٠)

# العنف

## وإدارة الصراع السياسي في الفكر الإسلامي

تأليف:

د. عبد الحميد أبو سليمان

ترجمة:

عبدالله الكسنزاني

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(١٠)

# توندوتیژیی

## و

## ئیدارەی ململانێی سیاسیی لە فیکری ئیسلامییدا

نووسینی:

د. عەبدولحەمید ئەبو سلێمان

وەرگێڕانی:

عەبدوڵڵا کەسنەزانی

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی
(١٠)

# توندوتیژیی

# و

# ئیدارەی ململانێی سیاسیی لە فیکری ئیسلامییدا

نووسینی:
د. عەبدولحەمید ئەبو سلێمان
وەرگێڕانی:
عەبدوڵڵا کەسنەزانی

چاپی یەکەم
٢٠١٠ی زاینیی ١٤٣١ی کۆچی

مافی لەچاپدانی پارێزراوە

ناوی کتێب: توندوتیژیی و ئیدارەی ململانێی سیاسیی لە فیکری ئیسلامییدا.

نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەبو سلێمان.

وەرگێڕانی: عەبدوڵڵا کەسنەزانی.

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، ژمارە (١٠).

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٨٣٨)ی ساڵی (٢٠١٠)ی دراوەتێ.

چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١٠.

چاپخانە: شڤان.

تیراژ: (٥٠٠) دانە.

ئیمەیلی پەیمانگا: **iiitkurdistan@yahoo.com**

# پێشەكی

ڕوودانــی توندوتیــژی و پێكدادانــە خوێناویــەكان لــە ژیــانی كۆمەڵگــەكانی مرۆڤایەتیدا ژمارەیان كەم نییە، بە شێوەیەك كە پێشبینی نـەكرێت كـە لـە ژیـانی كۆمەڵگەو لێككـەوتنی شارسـتانیەكاندا ڕووبـدات، بـەڵكو گۆڕانـە بنەڕەتیـەكان لـە مێژوودا زۆرجار دێنەوە یاد لەگەڵ ڕووداو و پێكدادانە خوێناوییەكانـدا، جـا ئەگـەر ڕووداوە خوێناوییــەكانی مێــژووی ئیسلامییــشی بێتــە پــاڵ لــە: دووبــەرەكی، توندوتیژیی و كوشـتار لـە نێـوان كۆمەڵەكانـدا، دروسـت بـوونی چـەندەها پارچـەو میرنشین بـە هـۆی ئـەو ڕووداوانـەوە، ئـەو ڕووداوە خوێناوییانـە هـەر لـە كوشـتنی خەلیفـە عوسمانـەوەو ڕووداوە خوێناوییـەكانی دواتـری و درووسـتبوونی دەوڵەتـە سـتەمكارەكان، هـەموو ئەمانـە وایـان لـێ كـردم كـە گـوێ نـەدەم بـە مێـژووی ڕووداوەكـانی توندوتیــژی لــە نێــو كۆمەڵگــەی ئیــسلامییدا لــە كــاتی گــەڕان و لێكۆڵینــەوە لــە ســەر هۆكارەكــانی ســەركەوتنی، یــان شكــستی، یــان ڕۆڵــی بزووتنــەوەكانی چاكـسازی، یـان شكـستخواردنیانو لەناوچـوونی قـەوارەكانیانو دابەزینو كەمبوونەوەی ڕۆڵی شارستانییەتیان.

ئـەوەی بـە لای منـەوە گـرنگ بـوو لـەو لێكۆڵینـەوەدا ئـەو گۆڕانانـە بـوو لـە پێكهاتەی قاعیدەی جـەماوەری سیاسـیی، ئـەو دەرەنجامانـەی بـە هـۆی ئـەوەوە ڕوویدا لە تێكچوونی جۆرێتی سەركردایەتی، تێكچوونی ئاراسـتەكانیان، شـێواندنی دامەزراوەكەی، ئەمانـەش وای كـرد كـە ئوممـەت لـە ڕێـڕەوی خـۆی لادات، كیـانی دەستبژێرەكانی تێك بچێت، ئەمەش بووە هۆی تێكـچوون و كەمبوونـەوەی ئـەدای ئوممەت و توانای داهێنانی و پچڕانی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان و دابەشبوونی، هەروەها بووە هۆی ڕووخانی دامـەزراوەو سیـستەمە كۆمەڵایەتییـەكانی، بـە هـۆی

ئەمانە هەمووی ئەدای شارستانی ئوممەت ڕووخا و شکستی خوارد لە بەردەم هێرشی زانست و تەکنەلۆجیای ڕۆژئاوادا.

بەڵام چۆن چەمکی توندوتیژی و پێگەی لە کارلێکی گرووپ و تەوژمە کۆمەڵایەتییەکاندا، ئەوانەی خەریکی چاکسازی کۆمەڵایەتی و سیاسیین لە مێژووی ئوممەتدا، لە هەوڵیاندا بۆ دروستکردنی گۆڕان بۆ هێنانەدی دادپەروەری و دژایەتی ستەم و گەندەڵی لە ناو کۆمەڵگەدا سەرنجی منی ڕاکێشا؟

ئەی بۆ گرنگیم دا بە لێکۆڵینەوەی ورد لە وردەکاری ئەو ململانێیانەو کارلێکیان لەگەڵ ئەو هێزانەی لە پشتیانەوەن، لەگەڵ ئەو ڕۆڵە جیاوازانەی کە دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن دەیبینن و بەشێکن لە دروستکەری، هەتا دەگاتە ئەو شێواز و ئامرازانەی هەر لایەك پەنای بۆ دەبەن لە ئیدارەی ململانێ و هێنانەدی ئامانجەکانیان، هەروەها ئەو ئەنجامانەی هاتۆتە دی وەك دەرەنجامی هەوڵ و شێوازی هەوڵدانی چاکسازی خوازان بۆ گۆڕان و چاکسازی؟

هۆکاری سەرەکی ئەمانە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە لە خوتبەی هەینیدا گوێبیستی بووم، زانیاریم بەو فەرموودەیە نوێ نەبوو، چونکە ئەو فەرموودەیە و چەندەهای تر لە بابی فیتنەدا شتێکی باوەو زۆر باس دەکرێت و هەمووان زیاتر لە جارێك گوێبیستی دەبن، بەڵام لەو ساتەدا کە فەرموودەکەم هێنایە بەرچاوم حەزم کرد بە وردی بیری لێ بکەمەوە، فەرموودەکە ئەبو داود لە ئەبو زەرەوە دەیگێڕێتەوە کاتێك پرسیار دەکات لە پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە توندوتیژی سیاسیی و فیتنە لە کۆمەڵگەدا، ئەویش فەرمانی پێ دەکات کە لە ماڵی خۆیدا بمێنێتەوەو تا ئەو ڕاددەی مافی بەرگریکردن لە خۆشی پێنادات: (قال قلت فإن دخل على بيتي، قال: فإن خشيت ان يبهرك شعاع السيف فالق بثوبك على وجهك يبوء بإثمك و إثمه). واتە: ئەگەر هاتە ناو ماڵەکەم، فەرمووی: ئەگەر

ترسایت تیشکی شمشێر کار بکاتە چاوت، جلەکەت بدە بە سەر دەموچاوتدا[1] و تاوانی تۆ و خۆیشی دەچێتە سەر ئەو.

فەرموودەکە ئەگەر بە وردی بیری لێ بکەیتەوە شتێکی سەرسوڕهێنەرە، چونکە وا دێتە بەرچاو کە پێچەوانەی ئەوە بێت کە لە زیهندا جێگیر بووەو زۆرێك لە ڕووداوە مێژووییەکانیش بەرجەستەیان کردووە لەوەی کە دەبێت بەرەنگاری لادان و خراپەو گەندەڵی ببنەوە بە هەموو ئامرازێکی ماددی و مەعنەوی، چونکە فەرموودەکە تەنها ڕێگری ناکات لە دەستپێشخەریکردن لە هەموو شێوازەکانی توندوتیژی، بەڵکو ڕێگری دەکات لە هەموو شێوازکانی توندوتیژی بە ناوی بەرگریکردن لە نەفس.

لە بیرکرنەوەی ئەو ساتە وەختەدا بینیم کە ئەو فەرموودەیە، ڕێنمونییەکی زۆری تێدایە، ئاماژەی زۆر گرنگ دەگرێتە خۆ، ناکرێت مرۆڤ تەنها بە سادەیی بە ڕێی بکات بێ ئەوەی هەوڵێکی جیددی بدات بۆ تێگەشتنی و ڕۆچوون لە قوڵایی ڕەهەندەکانیدا، بە تایبەت مێژووی ئیسلامیی پڕە لە فیتنە و ململانێ و شۆڕشی خوێناوی، بەڵام هەموو هەوڵەکانی چاکسازی شکستی هێناوە بە بێ ئەوەی بگاتە ئامانجە گەورەکانی تا ڕۆژی ئەمڕۆ.

بۆیە بە پێویستم زانی بە دوای لایەنەکانیدا بگەڕێم بۆ ئەوەی تێبگەم لە مەبەستی ئەو فەرموودەیە، لە کاتێکدا ئەو فەرموودەی فەرمووە لە دوارۆژەکانی ژیانیدا بووەو نەمانی گومڕایی بینیوە، بەڵام بەرچاوڕۆشنیەکەی بۆ دوای خۆی بەردەوام بووە.

پاڵنەرێکی تر ئەوەیە کە ڕێبازی بیرکردنەوەم وایە کە ڕازی نابم بە شوێنکەوتن و لاسایی کردنەوە و خۆبەدەستەوەدان بە بێ تێگەشتن و قەناعەت، هەروەها شێوازی بیرکردنەوەم وایە کە نامەوێت نوقمی وردەکاری ببم بە بێ ئەوەی وێنا

---

[1] ئیمام ئەحمەد و ئیبن ماجەش بە داڕشتنێکی نزیك لەم دەقە گێڕاویانەتەوە.

گەورەکەی پرسەکان ببینم، چونکە لە ڕێبازی گشتگیری شیتەڵکاریدا بۆ تێگەشتن لە قورسایی وردەکارییەکان دەبێت مرۆڤ دەرك بە پەیوەندی ئەو وردەکارییە بکات لە کات و شوێنی دیاری کراودا لەگەڵ وێنای گەورەی کێشەکە.

بنەما لە سەر ئەو ڕێبازە، دەستم کرد بە بیرکردنەوە لە فەرموودەکە، ڕووداوەکانی سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامم هێنایە پێش چاوی خۆم،ئەو شێوازانەی بەکارهاتووە لە گۆڕانە مەبەستدارەکانداو چۆن پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) ئیدارەی ئەو ململانێ سیاسییە چاکسازییە عەقیدەییەی کردووە لە قۆناغە جیاوازەکاندا، کە دروستبوونی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەککە و مەدینەی پێدا تێپەڕیوە، لەگەڵ دراوسێکانیدا ئەوانەی کە عەرەب نەبوون، لە دۆست و دوژمن و شوێنکەوتووانی ئایینەکانی تر.

لە ڕوانگەی ئەم وێنا گەورەیە و سەیرکرنی ڕێڕەوی ئیسلام بەدرێژایی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)، دەتوانرێت لە وردەکارییەکان تێ بگەین، کە ڕوویداوە لە ژیانی پێغەمبەردا و ئەو ئاماژانەی کە هەیەتی بە شێوازێکی دروست و هاوسەنگ و بە کەمترین هەڵە و خراپ تێگەشتن، چونکە گرنگ ئەوەیە کە وێنا گەورەکەت کێشا بێت و هەوڵی ئەوە بدەیت کە دەرك بە زۆرترین ڕەهەندەکانی بکەیت، بە ئاماژەکانی دوورکەوتنەوە لە سادەکردنەوەو ڕووکەش وەرگرتن و گوێنەدان بە ئاماژەی ئەو ڕەهەندانە و ئەو هۆکارانەی کە لە چواردەوری هەر ڕووداوێکن و کاریگەری هەیە لەسەر تێگەشتنی واتاو ئاماژەکانی، لە هەر پلان و سیاسەتێك کە مامەڵەی لەگەڵدا کردووەو بۆتە هۆی دروستبوونی.

بۆیە دەستم کرد بە بیرکرنەوە لە قۆناغی مەککە، کە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) دەستی کرد بە بانگەواز تێیدا بۆ ئیسلام، ئەو دەرەنجامانەی هەیبووە لە چاکسازی و بەرپاکردنی بەهاکانی یەکتاپەرستی و دادپەروەری و نەهێشتنی چەمکە بڵاوەکانی ناو کۆمەڵگا وەك: دەمارگیری و خۆبەزلزانین و ئەو گومڕایی و لادان و خراپەی لێیانەوە دروست دەبێت.

هەروەها بیرم کردەوە لە ئاماژەکانی بانگەوازی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککەدا، ڕەهەندە چاکسازییەکانی، لە بواری عەقیدە و سیاسەت، هەروەها شێوازی ئیدارەی ئەو بۆ ململانێی سیاسیی عەقیدەیی لە بەرزترین ئاستیدا لەو کۆمەڵگەیەدا، هۆکارەکەشی ڕاگەیاندنی بانگەوازی ئیسلامیی بوو کە ئامانجی چاکسازی و گۆڕانێکی بنەڕەتیی کۆمەڵایەتی بەرفراوان بوو.

دواتر بیرم لە شێوازی پێغەمبەر (ﷺ) کردەوە لە ئیدارەی ململانێدا، دوای ئەوەی لە مەککە دەرچوو و کۆچی کرد بۆ مەدینە و دەوڵەتێکی ئیسلامیی و یەکتاپەستی و دادپەروەری تێدا دامەزراند لە بەرامبەر دەوڵەتی شیرك و ستەمی مەککە، چۆن سیاسەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینەدا گۆڕا و پەنای بردە بەر ئامرازی جیاواز لەوەی لە مەککە بەکاری دەهێنا بۆ ئیدارەی ململانێی سیاسیی چاکسازی نێوان موسڵمانان و موشریکەکان.

پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا سروشتی ئەو ململانێیە ناوخۆییەی ناو کۆمەڵگەی مەککە هۆکار بوو بۆ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) شێوازی ئارامگرتن و بەرگریکردنی ئاشتیانە پیادە بکات لە کۆمەڵگەی مەککەدا، چونکە خزمایەتی هەبوو لە نێوان موسڵمان و موشریکەکانی مەککە و هەمووان سەر بە یەك کۆمەڵگە بوون؟ ئایا هۆکاری جیاوازی شێوازی ئیدارەی ململانێ لە نێوان دوو کۆمەڵگەی جیاواز لە نێو یەك کۆمەڵگەدا هۆکاری جیاوازییانە لە ئینتیمای سیاسیی و عەقیدەیی، هەروەها جیاوازی هەست و ویژدان و بەرژەوەندی ماددی و ئەدەبی بۆ هەر کۆمەڵگەیەك و نوخبەی دەسەڵات؟

هەروەها لێکۆڵینەوەم کردووە سەبارەت بە شێوازی پێغەمبەر (ﷺ) و ئامرازەکانی لە ئیدارەی ململانێ لە نێو کۆمەڵگە و دەوڵەتی مەدینە بە هەموو گرووپەکانیەوە، ئەوانەی کە جیاوازییان هەیە لە ئینتیما و بەرژەوەندی گرووپ و هۆزو بیروباوەڕ، لە نێوان موسڵمان لە ناو مەدینە و جولەکە لە چواردەوری، لە نێوان کۆچبەرانی قورەیش و پشتیوانانی ئەوس و خەزرەج، لە نێوان ئیماندار و

مونافیق، بۆ ئەوەی بزانم هێشتا لـە ئیـدارەی ململانێـی سیاسـیی نـاو کۆمەڵگـەی مەدینەدا هەمان شێواز و ئامرازی کۆمەڵگەی مەککە، لە وازهێنـان لـە توندوتیـژی، بە شتێکی گونجاو دەزانێت و ڕێگەچارەی سیاسیی دەگرێتـە بـەرو مامەڵـە لەگـەڵ لادان و توندوتیـژی لـە لایـەن گرووپەکانـەوە دژی موسـڵمان لـێ دەگـەڕێت بـۆ سەرکردەکان و ڕای گشتیی و شوورا؟

لـە ژێـر ڕۆشـنایی ئـەم وێنـە گەورەیـە — ڕەچـاوکردنی هـەموو هۆکـار و سیاسەتەکان و ڕووداو و مامەڵە و ئەو شتانەی کـە پەیوەنـدییان هەیـە — هۆکـارە پێکهێنەرەکانی و کاریگەری لە سەری، هەوڵمداوە کە هۆکارە گرنگـە هاوبەشـەکان لە سیاسەتەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) و ئاماژەکـانی بدۆزمـەوە، ئـەو شـتانەی واتـای ڕووداو و سیاسەتەکان دیاری دەکات، هۆکاری هەڵبژاردنی شێواز و ئامرازەکان کـە پێغەمبـەر (ﷺ) بـەکاری هێنـاوە لـە هـەر قۆنـاغێکی بـەڕێوەبردنی ململانێـی چاکسازی کە مەبەستی بووە لە بانگەوازی ئیسلامییدا.

دەرەنجامە گرنگەکانی ئەم لێکۆڵینەوە مەنهەجیە گشتگیرە شیتەڵکارییە کـە پەیڕەوم کـردووە لـە شـیتەڵکردن و ڕاڤـە کردنـی دەقـەکان و ڕووداوەکـان لـە ژێـر ڕۆشنایی وێنا گەورەکـە، هۆکارێـك بـوو بـۆ تێگەشـتنی ڕووداوەکـان و تێگەشـتنی ئاماژەکـانی سیاسـەتەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) کـە پیـادەی کـردوون بـە درێـژایی تەمەنی بانگەوازی و هەتا وەفاتی، بە شێوازێك لـە ڕوونـی و ڕێکخستنیدا شـتێکی نوێ و پێشبینی نەکراو بوو هەتا بۆ نووسەر، کە بووە هۆی چاوکرانەوەم بـە ڕووی چـەندەها ڕەهەنـد، کـە لـە خەیاڵمـدا نـەبوو، ئەمانـە هـەموو هۆکـاری گرنگـی بڵاوکردنـەوەی ئـەم کتێبـە بـوو، هـەروەها سەرنجڕاکێشانی خوێنـەر بـۆ لای ئـەو ڕەهەندە گشتییە کە ئـەم لێکۆڵینـەوە پێـی گەشـتووە و لایەنـەکانی لـەم کتیبـەدا باسکراوە.

ئەوەی کە ئەم لێکۆڵینەوە ڕوونی کردۆتەوەو بە ئەنجام گەشتوە تێدا، ئەوەیـە کە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بنەمای زۆر گرنگیان هەیە، سیاسەت و پلان و

ستراتیژیەتی ڕوون و ئاشكراو دیاریكراو، پابەند بووە پێوەی لە ئیدارەی ململانێ سیاسییەكاندا كە مەبەست لێی گۆڕان و چاكسازی ئیسلامیی و بەرەنگاربوونەوەی فەساد بووە.

جا ئەگەر ئامانج و بنەماكان جێگیر بووبێت، سیاسەت و پلان شتێكی نەگۆڕ و بەستوو نەبووە، بە شێوازێك سروشتی هەڵوێست و بارودۆخەكان پشت گوێ بخات كە مامەڵەیان لە گەڵ دەكات.

پلانەكان بە گوێرەی بارودۆخەكان دروست دەبێت بۆ ئەوەی كاریگەر بێت، بە بێ ئەوەی ئامانجە جێگیرەكان زەرەر بهێنێت، یان زەرەر بە بنەماكان بگەیەنێت كە پشتیان پێ دەبەستێت لە بە ئامانج گەشتندا، دواتر پلانەكان دەبێت زۆرترین گاریگەریی و توانایان تێدا بێت.

لە ژێر ڕۆشنایی سیاسەتەكانی پێغەمبەر (ﷺ) و ڕێنمونیە قورئانییەكان بۆ نووسەر ڕوون بۆتەوە كە بۆچوونێكی ڕوون هەیە سەبارەت بە جیاوازی گۆڕەپانی سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوە، ئەویش بە هۆی ئەوەی كە هۆكارە كاریگەرەكانی هەر گۆڕەپانێك بە سروشتی خۆی جیاوازە لەوی تر.

هەر لە ئەنجامەكانی ئەم لێكۆڵینەوە گشتگیرە شیتەڵكارییە ئەوەم بۆ دەركەوت كە ئەو دەقانەی وا دەردەكەون كە دژ بە یەكن و ناكرێت بە یەك شێوە مامەڵەیان لەگەڵ بكرێت، مەگەر بە نەسخ بوونەوەو لێ قرتاندن، یان گۆڕینی واتاكانیان و لاركرنەوەیان، ئەو كاتەش دەبنە هەندێك پرسیاری ڕاماوكەر –حائر– كە لە دڵدا جێگیر نابن و واتاكان دروست نابن و تەنها بە دابەشكراوی مامەڵەیان لەگەڵ دەكرێت، یان بە هەڵبژاردنی هەندێكی و هەر لایەك بەشێكی دەكاتە بەڵگەی خۆی و بەكاری دێنێت بۆ مەبەستی خۆی.

گومانی تێدا نییە ئەو بابەتانەی كە سیاسیین لە ناو كۆمەڵگەدا چارەسەر ناكرێن بە شێوەیەكی باشو ئیجابی تەنها بە ڕێگەچارەی سیاسیی نەبێت، ناكرێت شەرعیەت بدرێتە هەر چارەیەكی تر كە لە سەر زاڵبوون و زۆرلێكردن بنیات

نرابێت، لەلایەن هەر گرووپێکەوە بێت، حاکم بێت یان مەحکوم، لە هەموو ئەو کێشانەی پەیوەستە بە سیاسەتی گشتیی کۆمەڵگەوە.

ئەو چاکسازی و گۆڕانەی کە بەردەوام دەبێت لە سەر بانگخوازانی پێویستە ئامرازی ئاشتیانە بەکاربێنن و ئارامی لە سەر بگرن، هەر کۆمەڵگەیەك پابەند بێت بە بەکارهێنانی ئامرازی ئاشتیانەی سیاسیی بۆ گۆڕین و چاکسازی، بێگومان کاروانە شارستانییەکەی سەرکەوتوو دەبێت و کۆمەڵگەکەی شورا بە دەست دێنێت، بەڵام هەر کات گرووپێکی کۆمەڵگە لەو ڕێڕەوە لای داو دەستی دایە بەکارهێنانی توندوتیژی لە دژی بانگخوازانی چاکسازی ئارامگر، باشترین هەڵبژاردە بۆ چارەسەری ئەوە ڕای گشتییە، کە دەبێت سنوورێك بۆ دەستدرێژی ئەوانە دابنێت.

سەرەنجام جگە لە شورا ئامرازێکی دروست نییە بۆ گەشتن بە ڕێگەچارەی سیاسیی سەرکەوتوو، بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارە گشتییەکانی کۆمەڵگە، بۆ بەدەستهێنانی پێشکەوتن و ئاوەدانی لەسەر بنەمای دادپەروەری و یەکسانی و شورا.

نووسەر پێشتر لەسەر ئەم بابەتە، بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە بە زمانی ئینگلیزی لە گۆڤاری (المجلة الامريكية للعلوم الاجتماعية) کە پەیمانگای فیکر دەریدەکات، هەروەها (جمعية علماء الاجتماعيات المسلمين فى امريكا) ژمارەی دووەم، بەرگی هەشتەمی ساڵی ١٩٩١، کە کرۆکی هەموو بیرکردنەوەو تێگەشتنەکانی لەم بابەتەدا خستبووە ڕوو لە بۆچوونی ئیسلامیی لە سەر بابەتەکە کە بە هۆی لێکۆڵینەوەو تێفکرین بۆی دروست بووبوو.

بۆ بەشدارییکردن لەو گفتوگۆ بەردەوامەی لە جیهانی ئیسلامیی و وڵاتانی عەرەبیدا لەم کاتەدا هەیە، بە تایبەتی ئەوەی سەبارەت بەو توندوتیژییەی زۆرێك لە وڵاتانی ئیسلامیی گرتووەتەوە، ناجێگیری دروست کردووە، سەروەتەکانی لەناو دەبات و وورەی گەنجانی دەڕووخێنێت، هەروەها بۆ بەشداری لەو گفتوگۆیەی

کە هەیە سەبارەت بە (دیموکراسی) کە بڵندگۆکانی ڕۆژئاوا بانگەشەی بۆ دەکەن و هـەرایان ناوەتـەوە لـە سـەر ئـەو شـتانەی پەیوەسـتە بـەوەوە، یـان لـە لایـەنی فیکریـەوە، تێـك ئـاڵاوە و ڕاگەیاندنـەکان بـە ئاراسـتەیەکی سیاسـیی مەبەسـتدار دەیبەن، کە بۆتە بیانوو بە دەست زلهێزەکانەوە بۆ دەستێوەردانی کاروبـاری ئـەو وڵاتانــە، بــۆ زاڵبــوونی کــەلتورو ئــابووری ڕۆژئــاوا و لــە خزمــەتی سیاســەت و بەرژەوەنـدی و زاڵبـوونی نەتـەوەییان، کـە بـە داخـەوە زۆرێـك لـە چـینەکانی کۆمەڵگەی عـەرەبی و ئیسلامی بـە نیـەتی پاکـەوە بـەرەو پـیری دەچـن، چـونکە دەسەڵاتی حکومەتەکانیان خراپن‌و پەنا دەبەنە بەر ستەم و فەسـادو تـیرۆر و بـە خراپ هاووڵاتی بەکارهێنان، هەر بۆیە نووسەر پێی باش بـوو بابـەتێکی درێـژ بـڵاو بکاتـەوە لـە گۆڤـاری (اسـلامیة المعرفـة) کـە پـەیمانگای فیکـر دەری دەکـات، لـە ژمارەی ١٥ ی زستانی ساڵی ١٩٩٩م.

ئەم پەرتوکەش بە شـێوەیەکی فـراوانتر بابەتەکـە پیـشکەش دەکـات و لایەنـە جیاوازەکـانی بـاس دەکـات، گـرنگترین ئـەو دەقانـەی پەیوەسـتە بـە بابەتەکـەوە گفتوگۆم لەسەر کردووەو ئـەو ئەنجامانـەم خـستۆتە ڕوو کـە پێـی گەشـتووم، بـە تایبـەتی بنـەما گـشتییەکان، کـە پێموایـە یارمەتیـدەر دەبێـت بـۆ ڕوونکردنـەوەی هەندێ لایەنی گرنگ لە کردەوەکانی ئوممەت، کە بە هەڵـە تێگەشـتن و هەڵـەکردن لە جێبەجێ کردنیدا بۆتە هۆی –هەتا ڕۆژگـاری ئـەمڕۆ– شکستی بزووتنـەوەکانی چاکسازی سیاسـیی لـە مێـژووی ئیـسلامییدا و نەگەشـتوونەتە ئامـانجی گـەورە و چاکـسازی و گـۆڕانی بنـەڕەتییان پـێ نـەکراوە، یـان بنـەماکانی دادپـەروەری و یەکتاپەرستی جێگیر بکەن، بەڵکو ڕەنگـە ئـەو کـردەوە توندوتیـژە هەڵانـە هۆکـار بووبێت بۆ ڕەچەڵەك داکوتانی کارە توندوتیـژەکان و سـتەم و فەسـاد و تـاکڕەوی ڕژێمە دەسەڵاتدارەکان.

پێموانییە هیچ ڕێگەچارەیەك لە بەردەم ئوممـەتی ئیـسلامیدا هـەبێت جگـە لـە چاکــسازی لــە فیکــر و لــە پەیڕەوەکانیانــدا، پاککردنــەوەی تێگەشــتنەکانیان،

پابەندبوون بە ئامرازی ئاشتیانەی پەروەردەیی شوورایی بۆ سەرخستنی هەوڵەکانی چاکسازی و گۆڕان، بەو شێوەیە دەکرێت لە کەسایەتی ئەو مرۆڤەی دەبێتە جێنشین و شایەنی هیدایەت و ئاوەدانکەرە جارێکی تر داڕێژرێتەوە.

داواکارم لە خوای گەورە هیدایەتمان بدات و هیدایەتی ئوممەتی ئیسلام بدات بۆ ڕێگەی ڕاست، بێگومان ئەو توانای هەموو شتێکی هەیە.

**عەبدولحەمید ئەبو سلێمان**

**هیرندن - ڤێرجینیا**

**وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا**

## خولانەوە لە نێوان بنەماو ئەنتەرناتیڤی تردا

لە کۆتایی سەدەیەك لە ململانێی سیاسی و شەڕی ناوخۆیی کە بە ئاوابوونی خیلافەتی ڕاشیدین دەستی پێ کرد، دوای ڕوودانی چەندەها شۆڕش و گرنگترینیان ئەوانەی حوسەینی کوڕی عەلی و عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر و (محمد النفس الذکیة) بوو، کۆتایی هاتنی بە ڕووخانی دەوڵەتی ئەمەوی و دامەزراندنی دەوڵەتی عەباسی کە لە ناوەرۆکدا جیاواز بوو لە سیستمی دەوڵەتی ئەمەوی، ئەوەبوو پیاوانی مەدرەسەی مەدینە[٢] فەتوایان بە حەرام بوونی فیتنە[٣] دەرچوون لە دەسەڵات و دژایەتی کردنی ئەگەر ستەمکاریش بوو بێ.

ئەم هەڵوێستە نموونەییەی پیاوانی مەدرەسەی مەدەنی لە خۆشویستنی ستەم نەبوو، یان بە کەمزانینی ستەم نەبوو، بەڵکو دەرەنجامێکی سروشتی شکستی ئەو شۆڕش و شەڕە ناوخۆییانە بوو کە کارێکی یەکلانەکردەوەو هیچێك لە سروشتی سیاسیی و کۆمەڵایەتی ئەو ڕژێمانەی نەگۆڕی کە شایەنی باس بێت، بەرووبومێکی وای نەبوو کە دیار بێت جگە لە خوێنڕشتن.

لێرەشدا پیاوانی (مەدەرەسەی مەدینە– ئیسلامییەکان) — دوای ئەوەی کە هیچ چارەیەکیان نەما لە مامەڵەکردنێکی کاریگەر و تێگەشتنی ئەو دیاردەیەدا — گەشتنە ئەو ئەنجامە سروشتیەی  کە واجبە بگوازنەوە لە شۆڕشەوە بۆ کەنارگرتن و ئۆپۆزسیۆنی، بە بەکارهێنانی هەموو ڕێگەچارەیەکی تر– لە چوارچێوەی ئەو سیستمەی لە ئارادا هەیە– کە لە بنەماکان و ژیانی ئیسلامییدا دەکرێت بگیرێتە

---

[٢] لەم کتێبەدا مەبەستمان لە (مەدرەسەی مەدینە) و (ئیسلامییەکان) پیاوانی مەدرەسەی فیکری ئیسلامییە، کە شوێنکەوتەی فیکری سوننەتی پێغەمبەر و خیلافەتی ڕاشیدین و ڕەفزی دووبەرەکی ڕەگەزی و چینایەتی و هۆزایەتی و گەلایەتی و تاکڕەوی دەکەن. نووسەر ناوی لێناون ئیسلامییەکان، چونکە دەستیان گرتبوو بە دەقە ئیسلامییەکانەوە.

[٣] فیتنە لە زمانی عەرەبیدا مەبەست پێی شەڕ و دووبەرەکی ناوخۆییە کە یەکڕیزی ناهێڵێت، لەبەر ئەوەی کە وشەیەکی پڕاوپڕی کوردی نییە لە بەرامبەریدا، هەر وشە عەرەبیەکە بە کاردەهێنین.

بەر بە بێ زیاتر خوێنڕشتن، هەربۆیە دەبینین یەکێك لە پیاوانی مەدرەسەی مەدینە– ئیسلامییەکان، کە پێیان دەوترێت (زانا) و نوێنەری زۆربەی ڕۆشنبیرانی ئوممەتن، ئەویش ئەبو حەنیفەیە، دەچێتە بەندیخانەوە، چونکە ڕازی نابێ ببێتە دادوەر لە دەوڵەتی عەباسیدا.

وەك دەرەنجامێکی ئەو دابڕانە لە نێوان (زانایان) کە (ڕابەری فیکری و عەقیدەیی ئیسلامیی ئوممەتن) لە لایەك و (کاربەدەستان) کە (سەرکردەی سیاسی ئوممەتن)، زاناکان لایەنی تایبەتی تاکی موسڵمانانیان لە خۆ گرت، سەرکەوتوو بوون لە ئاراستەکردنیدا بەو زانست و ئیخلاص و دەستپاکییەی هەیانبوو، بە ناچاریش کاروباری دەوڵەت و فەرمانڕەواییان بەجێهێشت بۆ ئەوەی (پاشا و کاربەدەستان) بەڕێوەی بەرن بەو شێوەی کە دەگونجێ لەگەڵ ئارەزوویاندا، کە بووە هۆی ئەوەی – دواتر– تاکی موسڵمان سیستمی حوکمڕانی و دەسەڵاتی گشتی بە دەست بەسەرداگیراو بزانێت و بە ناشەرعی لە قەڵەم بدات.

دروستبوونی ئەو بۆچوونەی تاکی موسڵمان لەو بارودۆخەی مێژوودا – بەدوور لە ڕەچاوکردنی هۆکارەکانی– یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی لاوازی ڕەهەندی کۆمەڵی و هاریکاری گشتیی، لە دروستبوونی نەفسیەتی تاکی موسڵماندا، گرنگترین هۆکارێکە بۆ لاوازی نەفسی و سلبی بوون بەرامبەر بە سیستمی فەرمانڕەوا و بەرژەوەندی گشتیی کۆمەڵگە[٤].

لە ڕاستییدا ئیدانەکردن و بە خراپزانینی دەرچوون لە دەسەڵات و دانانی بە فیتنە و شێوازێکی نەگونجاو، لە لایەن زانایانەوە هەڵوێستێکی مەبدەئی و لە قەناعەتێکی زانستییەوە سەرچاوەی نەگرتبوو، پێیان وابێت کە بەکارهێنانی توندوتیژی و دژایەتی چەکداری دژی فەرمانڕەوای ستەمکار شتێکی نەگونجاوە،

[٤] بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ کتێبی (أزمة العقل المسلم)ی نووسەر، کە لە بڵاوکراوەکانی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامییە، هێرندن -ڤێرجینیا- وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ١٩٩٢م.

مـــەیلیان هـــەبێت بـــۆ شـــێوازی فیکـــری و پـــەروەردەیی بـــۆ پێکهێنـــانی بنەڕەتـــە سیاسییەکانی سیستمی حـوکم، بـەڵام لـە راسـتییدا تەسـلیمبوون بـوو بـە ئـەمری واقیع لە سەر بنـەمای بەرژەوەنـدی و زەرورەت، واتـا ئـەو بۆچـوونەی زانایـان لـە بەکارنەهێنانی توندوتیـژی بـۆ مەبەسـتی چاکسازی لـە لایـەن چاکسازیخوازانەوە تەنها مەجبور بوون پێی ڕازی بـوون، نـەك ئـەوەی کـە بنەمایـەك بێـت پابەنـد بـن پێوەی.

بـە ڕای ئێمـە هۆکـاری ئـەم هەڵوێـستە نـاجێگیرە ناڕوونـە، دەگەڕێتـەوە بـۆ تێکـەڵکردنی سـێ پرسـی گـرنگ: پرسـی ململانێـی سیاسـیی نـاو ئوممـەت و یـەك کۆمەڵگـەی سیاسـیی، پرسـی ململانێـی سیاسـیی نێـوان ئوممـەتان و کۆمەڵگـە بەرابەرەکان، هەروەها ئەو پرسانەی پەیوەستە بـە کێبڕکێیانـەوە لـە دەرەنجـامی بانگەواز و فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە و هانـدان بـۆ ڕەوشـتە بـەرەزکان و دژایەتی ستەم و بانگەواز بۆ بەجێهێنانی هەق.

دەرەنجـامی زانـستی ئـەو تێکەڵکارییـەش کوێربـوونی دیـدی ڕێبازییـە، بـە شێوەیەك ڕەنگە بەکارهێنانی توندوتیژی بە یەك چاو سەیر بکرێت لـە هـەموو ئـەو حاڵەتانەدا، بەکارهێنانی یان بەکارنەهێنانی توندتیـژی لـە هـەر ڕووداوێکـی نـاوخۆ یان دەرەکی لە هەر ئاستێکدا، بۆ هەر مەبەسـتێك بێـت شـتێکی ئیختیـاری بێـت و نەبێت بە بنەما، مەبەست لـە بنـەماش شـتێکی نـەگۆڕ کـە بـە گـۆڕانی بـارودۆخ و دینامیکیەتەکان نەگۆڕێن.

ئەم ڕاڕایی و ناڕوونی بۆچوون و تێگەشتنە لە بابەتی توندوتیژیدا لە هەر یـەکێ لەو سێ حاڵەتەی باسکران، لە بنەڕەتدا ئەوە ڕووندەکەنەوە کە بۆچی موسـڵمانان بەردەوامبوون لە خولانەوە لە خۆبەدەستەوە دان و بەرگری ئاشـتییانە و بـەرگری چەکدارانە لە دژی ستەم و ڕژێمە ستەمکارەکان، بە بێ ئەوەی جیـاوازی بکـەن لـە نێـوان پرسـی چاکـسازیی سیاسـیی نـاوخۆی کۆمەڵگەیـەك و پرسـی ململانێـی و ڕووبەڕووبوونەوەی سیاسـیی لـە نێـوان کۆمەڵگـەکان و سیـستم و دەوڵەتـە دژ بـە

یەکەکان، هەروەها ئەو دەرەنجامانەی دروست دەبێت بە هۆی بانگەواز و فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە و یارمەتی لە لابردنی ستەم و هاندان لەسەر ڕەوشتی جوان لەو سنوورەی کە سیاسەتی شەرعی و سروشتی مامەڵە لەگەڵ دەسەڵاتدار ڕێی پێدەدات، بەڵام ناگاتە ئاستی ململانێی سیاسیی و کێبرکێ لە سەر دەسەڵات لە ناو کۆمەڵگەیەکدا.

ئەم خولانەوە لە بەکارهێنانی توندوتیژی لە نێوان بنەماو سەرپشك بووندا لە هەموو جۆرە ململانێکانی سیاسیی و کێبرکێی بانگەوازی، تا ئێستاش ئوممەت بە دەستیەوە گیرۆدەن لە زۆربەی پرسەکاندا، هەرچەندە چەندەها سەدە تێپەڕ بووە، ئەم ناڕوونییە لە دیددا لەم پرسە گرنگەدا بە داخەوە بۆتە هۆی خوێنڕشتن بە بێ بەروبووم و مانەوەی سروشتی ستەمکارانەکەی ڕژێمەکان.

بۆ یەکلاکردنەوەی ئەم پرسە و وەستاندنی خوێنڕشتن، پێویستمان بە فیکر و لە سەرخۆیی و دیدێکی گشتگیری دروستی ڕوون بۆ دەقە ئیسلامییەکان بە گشتیی لەگەڵ تێگەشتنی ئەزموونی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەو سەردەمانەی دواتری دەوڵەتی ئیسلامیی بە تێگەشتنێکی دروست، چونکە گشتگیری و مەنهەجێکی ڕێکخراو تەنها ڕێگەی گەشتنە بە دیدێکی ڕوون و دروست لە پرسی بەکارهێنانی توندوتیژی بۆ چارەسەری دووبەرەکییە سیاسییەکان و جیاکاری تێیاندا، هەروەها لە نێوان پرسەکانی فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە، کە پەیوەستە بە هەستی ئامۆژگاری کردنی یەکتری لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا.

ئەگەر سەیری دەقە ئیسلامییەکان بکەین، بە تێڕوانینێکی گشتگیری دروست، دەبینین کە زۆر شت دیاری دەکات و یارمەتی تێگەشتنی مەغزا و بنەماکان دەدات کە ڕێکیان دەخات، بە شێوەیەك کە لایەنە دیارەکانی دامەزراوە کاکڵەکەی دەردەکەوێت کە توانای تێگەشتنی جۆرەکانی توندوتیژی و ئاست و دینامیکی هەبێت سنوورێك دانێت بۆ خراپ بەکارهێنانی لە پەیوەندی کۆمەڵگە

ئیـسلامییەکاندا، هــەروەها یارمەتیـدەر دەبێــت بـۆ دانـانی جـۆرە سیاســەتێکی چاکسازی جێگیر و سنوورێك بۆ ستەم و تاکڕەوی دادەنێت.

هەروەها سەرنجی لێکۆڵەرەوان ڕادەکێشێت بـۆ ئـەوەی کـە دەقـەکانی قورئـان و سوننەت جیاوازی دەکـات لـە نێـوان پرسـی ململانێـی سیاسـیی نـاو ئوممـەت و یـەك کۆمەڵگــەی سیاســیی، پرســی ململانێــی سیاســیی نێــوان ئوممــەتان و کۆمەڵگــە بەرابـەرەکان، هــەروەها ئـەو پرسـانەی پەیوەسـتە بـەو کێبرکێیانــەوە دەرەنجـامی بانگەواز و فەرمان بە چاکەو بەرگری لـە خراپـە و هانـدان بـۆ ڕەوشـتە بـەرزەکان کـە ناچنە چوارچێوەی ململانێ لەسەر دەسـەڵات، بـەڵام ئـەوەی دەچـێتە ژێـر ململانێـی سیاسیی و توندوتیژی تێدا بەکاردێت دەچێتە بابی فیتنـە و ململانێـی سیاسـیی و لـە چوارچێوەی فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپەو پرسی ڕەوشتی جـوان دەردەچـێت و چارەسەری بە هەمان شێوازی چارەسەری ململانێی سیاسیی و فیتنە دەکرێت.

ئـەو دەقانـەی پەیوەسـتن بـە پرسـی توندوتیـژی و ململانـێ و دووبـەرەکی – بـە جیـاوازی شـێوازەکانیانەوە– زۆرن. هەنـدێکیان پەیوەسـتن بـە فیتنــە و ململانێــی سیاسیی ناو یەك کۆمەڵگا جا هەر شێوازێکی بێت و ئـارامگرتن و بەشـدار نـەبوون لـە کاری توندوتیژیدا بە مەبەستی چارەسەرکردنی، هەتا بە بیانوی بەرگریکردن بێـت لـە خودی خۆ، لە لایەکی ترەوە هەندێکی تر پەیوەستە بە جیهادی بەرگری دەستدرێژی و سەرخستنی ستەملێکراوان لە سەر ئەم زەوییەدا.

هەروەها هەندێکی تر پەیوەستە بە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە لە نێـوان موسڵماندا، پرسیارەکە ئەوەیە کە چۆن ئەو دەقە جیاوازانە ڕێکدەخەیت بەشێوەیەك پەیوەست بکـرێن بـە ڕووداو و هەڵوێـستە جیاوازەکانـەوە، لـە کاروبـاری سیاسـەت و بانگەواز و فەرمان بە چاکە لە لایەك، یان کاروباری سیاسی ناوخۆی ئوممەت، یاخود سەبارەت بـە سیاسـەتی دەرەوەی ئوممـەت یـان دەوڵـەت لـە لایـەکی تـر؟ هـەروەها پرسیارێکی تر ئەوەیە کە ئـەو یاسـا و ڕێـسایانە چـین کـە بـە کارهێنـانی توندوتیـژی ڕێکدەخەن لە هەر حاڵەتێك لەو حاڵەتانەدا، ئەی حیکمەت چییە لە بـەکارهێنانی یـان بەکارنەهێنانی توندوتیژی لە هەر یەکێك لەو حاڵەتانەدا؟

# گشتگیریی لە تێگەشتنی دەقە شەرعییەکان و ڕووداوەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) کە پەیوەستن بە شێوازی توندوتیژییەوە

ئەگــەر بمانــەوێت تێبگــەین لــە پەیوەنــدی نێــوان دەقــە شــەرعییەکان و هەڵوێستەکان و ئاراستە جیاوازەکان سەبارەت بە بـەکارهێنانی توندوتیـژی و هێـز لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا (ﷺ): دەبێـت لێکۆڵـەر لێکۆڵینەوەیـەکی مەنهـەجی گشتگیری مەبدەئی ڕوونی دروست بکات لە سەر دەقە شەرعییەکان، هەتا بتوانێت بگاتە تێگەشتنێکی مەبدەئی و مەنهەجی ئاشکرا لەم پرسەدا، هەروەها گرنگـە بـۆ تێگەشـتنی ئامـاژەی دەقـەکان و پەیوەنـدییان لـە ڕووی لایەنـە کۆمەڵایەتییـە تێکئالاَوەکانەوە، نابێت تەنها لێکۆڵینـەوە لـە سـەر دەقـە شـەرعییەکان بکـات بـە تەنها، بەڵکو دەبێت هەموو لایەنەکانی ئەزمونی پێغەمبەرایەتی بگرێتەوە، چـونکە ئەو ئەزموونـە چاکسازییە پێغەمبەرایەتییـە بـە چـەند قۆناغێـك لـە ململانێـی تـاڵ تێپــەڕیوە کــە وای کــردووە مەنهــەجی پێغەمبــەر (ﷺ) لــە ڕووداوو هەڵوێــستە جیاوازەکانـدا ڕێکـدەخات و بۆچـوونێکی داڕێـژراو پێـشکەش دەکـات و دەبێتــە ئەزموونێکی کامڵ بە گشتیی و مەنهجێکی پێغەمبەرانـە و پەروەردگارانـە دەخاتـە بەردەست لە ئیدارەی کێبڕکێی چاکسازی و چارەسەری دووبـەرەکی سیاسـیی لـە ناوخۆی کیانی ئوممەتدا[٥]، یـان لـە نێـوان کۆمەڵگـە سیاسـییەکان و فـەرمانڕەوادا، هەروەها ڕێنمایی دەدات بۆ فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپـە لـە سـەر ئاسـتی تـاك، یـان کۆمـەڵ و جیـاوازی دەکـات لـە نێـوان ئەمـەدا لەگـەڵ حاڵـەتی فیتنـە و ململانێی سیاسیی.

یەکـەم شـتێك کـە سـەرنجی لیکۆڵـەر ڕادەکێـشێت ئـەو فەرموودانـەن کـە بـە فــەرموودەکانی فیتنــە نــاودەبرێن و لــە پێغەمبــەرەوە (ﷺ) گێڕراوەتــەوە پــێش مردنی و بەرگری دەکات بە شێوەیەکی ڕەها لە بەشداریکردن لە فیتنە و ململانێـی سیاسیی چەکدارانە.

---

[٥] مەبەست لە (ئوممەت) بە شێوەیەکی گشتیی کۆمەڵێك یان کۆمەڵگەیەك کـە هەسـتێکی ئینتیمـای کۆمەڵگەو سیاسی هاوبەش تاکەکانی کۆ دەکاتەوە.

لەم فەرموودانەدا پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لە هاوەڵان دەکات لە مەدینە کە پەنا بەرنە بەر توندوتیژی بۆ چارەسەری فیتنە و ململانێی سیاسیی لە نێوان سەرکردەو ناودارەکانی کۆمەڵگە، فەرمان دەکات بە جڵەوکردنی نەفسی خود بە تەواوەتی، هەتا ئەگەر لایەنی بانگخواز بۆ چاکسازی تووشی دەستدرێژی هات لە کەسانی ترەوە.

خوای گەورەش دەفەرموێت: (وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَاناً فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ * لَئِن بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَاْ بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لَأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ *إِنِّي أُرِيدُ أَن تَبُوءَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ وَذَلِكَ جَزَاء الظَّالِمِينَ * فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ ( المائدة: ٢٧-٣٠). لەم ئایەتەشدا خوای گەورە چیرۆکی (قابیل و هابیل)مان بۆ دەگێڕێتەوە کە چۆن قابیل ویستویەتی هابیل بکوژێت و وەڵامی هابیل چی بێت باشە: ئەگەر تۆ دەتەوێت دەست درێژی بکەیتە سەر من و بمکوژیت من دەستت لێ ناکەمەوە، با تاوانی هەردوکمان بچێتە ئەستۆی تۆ. هەروەها دەفەرموێت:

(يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ) (لقمان: ١٧). لێرەدا لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات کە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە بکات و ئارام بگرێت لە سەر ئەو ناڕەحەتییەی بەو هۆیەوە دروست دەبێت.

هاو مەبەستی ئەو ئایەتانە کۆمەڵێك فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هەن، لەوانە:

لە ئوسامەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) سەیری بەشێك لە شاری مەدینەی کرد و فەرمووی: ئەوەی من دەیبینم ئێوە دەیبینن؟ من شوێنەکانی فیتنە لە نێوان ماڵەکانتاندا وەك شوێنی باران دەبینم[٦].

[٦] مەعمەر و ئیبن کەسیر و سلێمانێش لە زوهریان گێڕاوەتەوە.

بوخـاری لـه ئەحنـەفی کـوڕی قەیـسەوە دەگێڕێتـەوەو دەڵێـت: (چـووم بـۆ سەرخـستنی ئـەو پیـاوە[٧] لـە ڕێگـادا ئەبوبـەکرەم پـێ گەشـت و وتـی: بـۆ کـوێ دەچێت؟ وتم: بۆ پشتیوانی ئەو پیاوە دەچـم، وتـی بگـەڕێوە، مـن لـە پێغەمبـەرم (ﷺ) بیـستووە کـە فەرموویـەتی: ئەگـەر دوو موسـڵمان بـە شمـشێر دژی یـەك وەستان، بکوژ و کـوژراو دەچـنە ئـاگرەوە، وتم ئـەی پێغەمبـەری خـودا، ئەمـەیان بکـوژە ئـەی کوژراوەکـە بۆچـی؟ فـەرمووی: چـونکە ئـەویش سـوور بـوو لەسـەر کوشتنی هاوڕێکەی.

بوخاری لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَـةٌ وَيَكُـونَ الـدِّينُ كُلُّهُ لِلّه فَإِنِ انتَهَوْاْ فَإِنَّ اللّهَ بِمَـا يَعْمَلُـونَ بَـصِيرٌ) (الأنفـال: ٣٩). دەگێڕێتـەوە کـەوا ئیبن عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) پێیـان وت شـەڕکردن لـە کـاتی فیتنـەدا چـۆن دەبینی؟ وتـی: ئـەی تـۆ دەزانیـت واتـای فیتنـە چییە؟ پێغەمبـەر (ﷺ) شـەڕی لەگەڵ موشریکەکان دەکرد و تێکەڵی کردنیان فیتنە بوو، وەك ئێستا شەڕ لەسـەر دەسەڵاتە.

بوخاری لە ئیبن عومەرەوە دەگێڕێتەوە، کە دوو پیاو چـوون بـۆ لای لـە کـاتی فیتنـەی ئـیبن زوبێـردا و وتیـان: خـەڵکی سـەریان لـێ تێـك چـووە و تـۆش کـوڕی عومەری و هاوەڵی پێغەمبەری (ﷺ) چی وات لـێ دەکـات بەشـدار نـەبیت؟ وتـی: ئەوەی ڕێگریم لێ دەکات ئەوەیە کە خوای گەورە خوێنی براکەمی حـەرام کـردوە، وتیان: ئەی خودا نەیفەرمووە: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ) (البقرة: ١٩٣). واتە: شەڕیان لەگەڵ بکەن هەتا فیتنە نامێنێت، وتی: شەڕمان کـرد هـەتا فیتنـە نـەما و ئایین بۆ خودا بوو، بەڵام ئێوە شەڕ دەکەن هەتا فیتنـە دروسـت بێـت و ئـایین بـۆ غەیری خودا بێت.

---

[٧] مەبەستی عەبدوڵڵای کوڕی زوبێرە.

ئەبو داود لە ئەبو زەڕەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی فەرمووم: ئەی ئەبو زەڕ، منیش وتم: بەڵی ئەی پێغەمبەری خودا فەرمانت بەجێیە، فەرموودەکە دەگێڕێتەوەو تێیدا هاتووە: چی دەکەی کاتێك خەڵکی زۆر دەمرن و قەبرێك بە نرخی بەندەیەك بێت؟ منیش وتم خودا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، یان ئەوەی ئەوان بۆ منی هەڵدەبژێرن، فەرمووی: دەبێت ئارام بگریت، یان ئارام بگرە، دواتر فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ، منیش وتم: بەڵی ئەی پێغەمبەری خودا فەرمانت بەجێیە، فەرمووی: چی دەکەیت کاتێك بەردە ڕەشەکانی مەدینە دەبینیت بە خوێن داپۆشراون؟ وتم: ئەوەی خودا و پێغەمبەرەکەی بۆم هەڵدەبژێرن، فەرمووی: لەگەڵ ئەوە بە کە تۆ لەوی[٨]، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ئەی شمشێرەکەم نەخەمە سەر شانم (ئامادەبم بۆ بەرگری) فەرمووی: کەواتە بەشداریت کرد لە گەڵیاندا، وتم: ئەی فەرمانی چیم پێ دەکەیت؟ فەرمووی: لە ماڵی خۆتتدا دەمێنیتەوە، وتم: ئەی ئەگەر هاتنە سەرم بۆ ماڵەوە؟ فەرمووی: ئەگەر ترسایت تیشکی شمشێر کار بکاتە چاوت، جلەکەت بدە بەسەر دەموچاوتدا و تاوانی تۆ و خۆیشی دەچێتە سەر ئەو.

ئەگەر بە وردی بە تێڕوانینێکی گشتگیرانە، بڕوانینە کۆی دەقەکان و کۆی ئەزموونی پێغەمبەرایەتی لە سەرەتای دەسپێکی ئیسلامەوە لە مەککە هەتا دوا ساتەکانی ژیانی لە مەدینە، دەبینین کە موسڵمانان لە مەککە تووشی ئەشکەنجەو ئازاری زۆر بوون، بەڵام هەڵوێستی قورئان و هەڵوێستی پێغەمبەر (ﷺ) سوور بوون لە سەر بانگەواز بۆ هەق و پەنا نەبردنە بەر توندوتیژی بووە بۆ وەڵامدانەوەی کافران، لە بەرامبەر هەر دژایەتی و ئەشکەنجە و گەمارۆ و کوشتنی موسڵمانان لە لایەن دەسەڵاتدارانی قورەیشەوە.

---

[٨] ڕەنگە مەبەستی گەڕانەوە بێت بۆ ئەو لادێ و شوێنەی کەسو کاری تێدا دەژی و دوور بکەوێتەوە لە فیتنەکە.

گومانی تێدا نییە کە ئەم کارە فەرمان بوو بە چاکەو بەرگری لە خراپەو بانگەواز بۆ لای خودا و نەهێشتنی شیرك و ستەم بوو لە سەر ئاستی سیاسیی و عەقیدەیی و بە شێوازێکی زۆر کاریگەرانە، نموونەی ململانێیەکی توند بوو لە نێوان دەسەلاتدارانی قورەیش و کۆمەڵی چاکسازیخوازی موسڵمان.

هەڵوێستی قورئانی نەگۆڕا لەوەی کە ڕێ نەدات بە بەکارهێنانی توندوتیژی لە بەرامبەر دەستدرێژی قورەیش دوای موسڵمان بوونی هەندێك لە ئازا و شەڕکەرەکانی وەك حەمزە و عومەری کوڕی خەتاب کە داوایان دەکرد وەلامی قورەیش بدەنەوە بە هێز لە بەرامبەر هێزدا، بە توندوتیژیی لە بەرامبەر توندوتیژییدا، ئایەتەکانی قورئان زۆرێکیان شایەتی ئەو فەرمانە خوداییەو ئەو مەنهەجە پێغەمبەرانەیە کە ئارامگرتنی دەخواست، لەو ئایەتانە:

(فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ) (غافر: ٥٥). واتە: ئارام بگرە، پەیمانی خودا ڕاستە و داوای لێ خۆشبوون بکە بۆ گوناهەکانت و (سبحان الله) بکە، سوپاسی خودا بکە بە بەیانیان و ئێواران.

(وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلاً * رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلاً * وَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْراً جَمِيلاً * وَذَرْنِي وَالْمُكَذِّبِينَ أُولِي النَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلاً (المزمل: ٨- ١١). دوای هەندێك ئامۆژگاری پەروەدگار فەرمان دەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) ئارام بگرێت لە سەر وتەکانیان و بە شێوازێکی جوان جێیان بهێڵێت.

(وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ وَلَئِن جِئْتَهُم بِآيَةٍ لَيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ * كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ * فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ) (الروم: ٥٨- ٦٠). واتە: لەم قورئانەدا نموونەی زۆرمان هێناوەتەوە، ئەگەر هەر بەڵگەیەك بۆ کافران بێنیتەوە دەڵێن: ئێوە قسەی بەتاڵ دەکەن، خوای گەورە پەردە دەدات بە سەر دڵی

بێباوەڕاندا، تۆش ئارامبگرە و با بێباوەڕان لە جێگیری ئیمان و بەهێزیت کەم نەکەنەوە.

(يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ) (لقمان: ١٧). واتە: لوقمان کاتێك ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات پێی دەڵێت: ئەی کوڕەکەم نوێژ بکە، فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە بکە، ئارام بگرە لە سەر ئەو ناڕەحەتیەی توشت دەبێت، ئەوە لە کارە گرنگەکانە.

(قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي شَكٍّ مِّن دِينِي فَلاَ أَعْبُدُ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ وَلَـكِنْ أَعْبُدُ اللّهَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ * وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ * وَلاَ تَدْعُ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَنفَعُكَ وَلاَ يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذاً مِّنَ الظَّالِمِينَ * وَإِن يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلاَ رَآدَّ لِفَضْلِهِ يُصَيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ * قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءكُمُ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَا أَنَاْ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ * وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ وَاصْبِرْ حَتَّىَ يَحْكُمَ اللّهُ وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ) (يونس: ١٠٤ـ ١٠٩).

لێرەدا ئایەتەکە چەند ڕێنمونیەکی تێدایە، سەرەتای ئایەتەکان ئەوە دەگەیەنێت ئەگەر بێباوەڕان گومانیان لە ئیسلام هەیە ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) و شوێنکەوتووانی خوداکانی ئەوان ناپەرستن و خوای گەورە (الله) دەپەرستن، لە کۆتاییشدا دەفەرموێت: ئەی خەڵکینە هیدایەتتان بۆ هاتووە لای خوداوە، ئەوەی هیدایەت وەردەگرێت سوودەکەی بۆ نەفسی خۆیەتی و ئەوەش وەری ناگرێت ئەوە زەرەری بۆ خۆیەتی و پێغەمبەر (ﷺ) بەرپرس نییە لێیان و ئەی پێغەمبەر (ﷺ) دوای نیگای خودا بکەوەو ئارام بگرە هەتا ئەو کاتەی خودا خۆی بڕیار دەدات و هەر ئەو باشترین فەرمانڕەواو حاکمە.

(إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ * فَاتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيّاً حَتَّى أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ * إِنِّي جَزَيْتُهُمُ الْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوا أَنَّهُمْ هُمُ الْفَائِزُونَ) (المؤمنون: ١٠٩- ١١١). واته: (له ڕۆژی قیامەتدا) خوای گەورە بە کافران دەفەرموێت: کۆمەڵێك لە بەندەکانم دەیان وت: خودایە ئێمە باوەڕمان هێناوە و لێمان خۆشبە و ڕەحممان پیٚ بکە، تۆ لە هەموان بە ڕەحم تری، بەڵام ئێوە گاڵتەتان پێدەکردن و پێیان پێدەکەنین هەتا منتان لە بیر چوویەوە، ئێستا لەم ڕۆژەدا من پاداشتیان دەدەمەوە لەبەر ئەوەی ئارامیان گرت و هەر ئەوان براوەن.

بە هەمان شێوە دەبینین کە چۆن ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) و موسڵمانان گۆڕا سەبارەت بە بەکارهێنانی توندوتیژی لە دژی دەستدرێژیکاران، لە سەرووییانەوە قورەیش، کاتێك موسڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە و دەوڵەتی سەربەخۆی ئیسلامیان تێدا دامەزراند، کە چۆن قورئان ڕێی پێدان بجەنگن و بەرگری لە خۆیان و بانگەوازەکەیان بکەن، بەڵکو فەرمانی پێکردن کە بیکەن، ئەو کاتە پێغەمبەر (ﷺ) بەرەنگاری قورەیش و هۆزەکانی تر کە دژایەتی پێغەمبەر و بانگەوازە چاکسازیەکەیان دەکرد وەك بەرگری لە خۆ و لە ستەملێکراوان و وەك هەوڵێکی ئیسلام بۆ فەراهەمهێنانی ئازادی بیروڕا و شێوازی ژیانی بۆ ئادەمیزاد، پێغەمبەر (ﷺ) هەموو شێوازەکانی هێز و توندوتیژیی بەکارهێنا لە شەڕی دژ بەو کەسانە، هەتا دەگاتە کوشتنی هەندێك لە سەرکردە دەستدرێژیکارەکانیان لە تیرۆرکردنەوەو لە ناو خاکی خۆیاندا.

(أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ * الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّا أَن يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيراً وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ * الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ) (الحج: ٣٩- ٤١). واتە: ئەوانەی

ستەمیان لێکراوە ڕێیان پێدراوە کە شەڕ بکەن  خوا توانای سەرخستنیانی هەیە، ئەوانەی دەربەدەرکران تەنها لەبەر ئەوەی دەیان وت (الله) خودامانە، ئەگەر خودا ڕێ لە کەسانێك بە کەسانێکی تر نەگرێت شوێنەکانی پەرستن دەڕووخێنران، بەوانەی ئایینەکانی تریشەوە، خوای گەورەش هەرکەسی بوێت سەری دەخات، ئەوانەی ئەگەر ئێمە جێگیرمانکردن و دەسەڵاتمان پێدان نوێژ دەکەن و فەرمان بە چاکە و بەرگریی لە خراپە دەکەن، کۆتایی هەموو کارەکانیش بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە.

(كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ * يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ وَلاَ يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىَ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُواْ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَـئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ * إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أُوْلَـئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ اللّهِ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (البقرة: ٢١٦ـ ٢١٨) واتە: شەڕکردنتان لە سەر واجب کراوە، هەرچەندە شتێکە قورسە لە سەرتان و حەزی لێ ناکەن، ڕەنگە ڕقتان لە شتێك بێت و باشەی ئێوەی تێدا بێت یان حەزتان لە شتێك بێت و خراپەی ئێوەی تێدا بێت، پرسیارت لێ دەکەن ئەی موحەممەد لە شەڕکردن لە مانگەکانی حەرامدا، پێیان بڵێ تاوانێکی گەورەیە، بەڵام ڕێگە گرتن لە ڕێگەی خودا و مزگەوتی حەرام و دەرکردنی ئیمانداران تێیدا و کافر بوون بە خودا تاوانی گەورەترن و هەڵگەڕانەوە لە دین لە کوشتنیش گەورەترە، ئەوان بەردەوام شەڕتان لەگەڵ دەکەن هەتا پەشیمان دەبنەوەو هەرکەسیش پەشیمان بویەوەو بە کافری بمرێت ئەوا هەموو چاکەکانی پێشتری بەتاڵ دەبێتەوەو دەچێتە دۆزەخەوە، ئەوانەی کۆچیان کرد و

جیهادیان کرد بە تەمای ڕەحمی خوای گەورەن و خوای گەورەش ڕەحمیان پێ دەکات.

(وَقَاتِلُواْ الْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ) (التوبة: ٣٦). واتە: شەڕ بکەن دژی کافرەکان بە گشتیی، بەوشێوەیەی ئەوان شەڕتان لەگەڵ دەکەن بە گشتیی، ئەوەش بزانن خوای گەورە لەگەڵ پارێزکاراندایە.

(وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ * وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ وَلاَ تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ * فَإِنِ انتَهَوْاْ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ * وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّهِ فَإِنِ انتَهَواْ فَلاَ عُدْوَانَ إِلاَّ عَلَى الظَّالِمِينَ * الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ) (البقرة: ١٩٠- ١٩٤). واتە: شەڕ بکەن دژی ئەوانەی شەڕ دەکەن لە دژی ئێوەو زیادەڕەویش مەکەن و لە هەر شوێنێك بینیتانن بیانکوژن، دەربەدەریان بکەن وەك ئەوان بەرامبەر ئێوە کردیان، هەڵگەڕانەوە لە کوشتن خراپترە، لە مزگەوتی حەرامدا ئێوە شەڕ دەست پێ مەکەن هەتا ئەوان شەڕتان لەگەڵ دەکەن، ئەگەر شەڕیان پێ فرۆشتن بیانکوژن، ئەوە سزای کافرانە، ئەگەر وازیان هێنا و تەوبەیان کرد خوای گەورە غەفورە و ڕەحیمە، شەڕیان لەگەڵ بکەن بۆ ئەوەی فیتنە نەمێنێت و ئایین بۆ خودای گەورە بێت، ئەگەر وازیان هێنا ئەوە تەنها ستەمکارانن شایەنی دژایەتین و دوژمنن.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ أَرَضِيتُم بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ * إِلاَّ تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَاباً أَلِيماً وَيَسْتَبْدِلْ قَوْماً غَيْرَكُمْ وَلاَ تَضُرُّوهُ شَيْئاً وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (التوبة: ٣٨- ٣٩). لەم ئایەتەشدا خوای گەورە لۆمەی موسڵمان دەکات و دەفەرمووێت: بۆ کاتێك پێتان دەوترێت بڕۆن بۆ جیهاد (هەندێکتان)

لەشتان قورس دەبێت تەمبەڵی دەتان گرێت، خۆ ئەگەر فەرمانەکە بە جێ نەهێنن خودا سزاتان دەدات و قەومێکی تر دەگۆڕێتەوە بە ئێوە.

(أَلاَ تُقَاتِلُونَ قَوْماً نَّكَثُواْ أَيْمَانَهُمْ وَهَمُّواْ بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ وَهُم بَدَؤُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ أَتَخْشَوْنَهُمْ فَاللّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤُمِنِينَ * قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ) (التوبة: ١٣ـ١٤). واتە: ئەی ناجەنگن لە دژی قەومێك كە پەیمانەكەیان شكاند و ویستیان پێغەمبەر (ﷺ) دەربەدەر بكەن و دەستپێشخەرییان كرد، ئایا لێیان دەترسن، خوای گەورە شایستەترە لێی بترسن، شەڕیان لەگەڵ بكەن خوای گەورە بە دەستی ئێوە سزایان دەدات و شكستیان پێ دەهێنێت و ئێوە سەردەخات و دڵی كۆمەڵێك لە موسڵمانانیش ڕەحەت دەكات.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ قَاتِلُواْ الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ) (التوبة: ١٢٣). واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە بجەنگن لە دژی ئەو كافرانەی نزیكتانن و با ڕەقی و توندیتان تێدا ببینن.

(يُرِيدُونَ لِيُطْفِؤُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ * هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ * يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ * تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ * يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ * وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِّنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ) (الصف: ٨ـ ١٣) لەم ئایەتەدا خوای گەورە هانی موسڵمانان دەدات بۆ جیهاد و دەفەرموێت: كە بەشێك لەو بازرگانییەی سەرفرازی قیامەتتان دەكات جیهادكردنە لە پێناوی خوادا بە نەفس و ماڵ، ئەوجا خودا لێتان خۆش دەبێت دەتان خاتە بەهەشتەوە، لەم دنیایەشدا سەركەوتنتان پێدەبەخشێت.

(فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلاً * سَتَجِدُونَ آخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُواْ قَوْمَهُمْ كُلَّ مَا رُدُّوَاْ إِلَى الْفِتْنِة أُرْكِسُواْ فِيِهَا فَإِن لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُواْ إِلَيْكُمُ السَّلَمَ وَيَكُفُّواْ أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثِقِفْتُمُوهُمْ وَأُوْلَـئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَاناً مُّبِيناً) (النساء: ٩٠- ٩١). واته: ئەگەر وازیان هێنا لە شەڕکردن بۆتان نییە شەڕیان لەگەڵ بکەن، کەسانێکی تریش هەن بە حیسابی خۆیان ئاشتییان دەوێت، بەڵام خەریکی پیلانگێڕین، ئەگەر بە ڕاستی ئاشتییان بەرقەرار نەکرد و دەستیان هەڵنەگرت لە زیان گەیاندن بە ئێوە، شەڕیان لەگەڵ بکەن و لە هەر کوێ بینیتانن بیان کوژن.

(وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) (الأنفال: ٦١). واتە: ئەگەر ویستی ئاشتییان هەبوو، ڕازی بە، پشت بە خوای گەورە ببەستە، خوای گەورە زاناو بیسەرە.

(لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ * إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (الممتحنة: ٨- ٩). واتە: خوای گەورە نەهیتان لێ ناكات دادپەروەری و چاكە بكەن لەگەڵ ئەو كافرانەی شەڕیان نەكردووە لەگەڵتان و دەربەدەریان نەكردوون، بەڵكو نەهیتان لێ دەكات كە پشتگیری ئەوانە بكەن كە شەڕیان لەگەڵ كردوون و دەریان كردوون پشتگیریی دەركردنی ئێوە بوون.

دووبارە دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) توندوتیژیی قەدەغە دەكات یان بەكارهێنانی توندوتیژیی بەرامبەر توندوتیژیی وەك ڕێگەچارەی ململانێی سیاسیی نێوان موسڵمان خۆیان لە مەدینە، ئەمەش بەدیار دەكەوێت لە ڕێنماییەكانی و ئەو فەرموودانەی كە باس لە فیتنە دەكەن وە ك پێشتر باسمان كردن.

ئەگەر شتەكان بە تەرازوی عەقڵ بپێوین دەبێت حیكمەتی ئەوەمان بۆ دەركەوێت كە بۆچی ئیسلام ڕێگای دا موسڵمانان شەڕ بكەن و توندوتیژیی بەكار

بهێنن له دژی قورەیش و دوژمنانی تر دوای ئەوەی له مەککه دەرچوون، دوای ئەوەی لێیان حەرام کرابوو، بەڵکو قورئان و پێغەمبەر (ﷺ) نەك تەنها ڕێگایان پێدان، بەڵکو هانیشی دەدان و فەرمانیشی پێ دەکردن، مانای نییه قورئان له مەککەدا شەڕکردن حەرام بکات و له مەدینەدا ڕێگای پێ بدات به بێ ئەوەی حیکمەتێك و هۆکارێکی گرنگ له پشت ئەو مەسەلەوە نەبێت که بتوانرێت دەرکی پێ بکرێت، ئەگەر نا دەبێت یەکێك لەو هەڵوێستانه – نعوذ بالله– هەڵه بن، ئەمەش لەو بابەدا نییه که به هەڵه پێی دەڵێن (نسخ) واتا ئەو فەرمانەی دواتر دێت ئەوەی پێش خۆی هەڵوەشێنێتەوە، بەڵکو هەردوو فەرمانەکه تەواون و حوکمیان ماوەو دەگونجێن لەگەڵ یەکدا و واتاکەشی ئەوەیه که هەر یەکێك لەوانه پەیوەسته به بارودۆخی جیاواز مەبەستی جیاوازەوە، هەمان شت دەبینین سەبارەت به حوکمەکانی قورئان که یەکتری تەواو دەکەن نەك یەکتری هەڵوەشێننەوە و دژی یەکتر بن، چونکه ئەو تەشریعاته پەیوەستن به بنەماکانی کۆمەڵگەی بەشەریەتەوە له هەموو کات و شوێنێکدا، نەوەك شەرعێکی دانراوی پەیوەست بێت به قەومێکی دیاری کراوەوە له کات و شوێنێکی دیاری کراودا، به شێوەیەك که هەر شتێك پەیوەست نەبێت بەو کات و شوێنەوە ئیتر هەڵوەشاوە بێت و تەنها پەیوەست بێت به مێژووەوە، ئەمەش (نسخ– هەڵوەشانەوە) بەداخەوە بۆچوونێکه کەسانێکی زۆر پێوەی ئالودە بوون که به هەڵه تێگەشتون له پەیوەندی شەریعەتی قورئانی له گەڵ دەوڵەت و خەڵکی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) له و کات و شوێنەدا، جیاوازییان نەکردووە له نێوان ئەو شتانەو له نێوان ئەوەی که قورئان شەریعەتێکه حوکمەکەی فروانتره له کۆمەڵگەی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) لەو کات و شوێنەدا، بەڵکو پەوەسته به هەموو مرۆڤایەتیەوە به درێژایی کات و شوێن، بۆ ئەوەی پێداویستی مرۆڤایەتی بگرێتەوە به فرەیی و

(تعدد) سەردەمی کومەڵگەکان لە شوێنێکدا، وە فرەیی شوێنی کۆمەڵگەکان لە یەك کاتدا[٩]، ڕەنگە هۆکاری ئەم تێکەڵیە بگەڕێتەوە بۆ ئەو دیدە جوزئیە قیاسیەی بەردەوام زاڵبووە بەسەر لێکۆڵینەوەی شەرعیدا دوای ئەوەی هەموو ئامرازەکانی – هەرچەندە مەنهەجی (استحسان) زۆر شتی نوێ دەگرێتە خۆ– بە تەنها پێداویستی کۆمەڵگەکانی دابین نەدەکرد، بە هۆی گۆڕانکاری و شتی نوێ دروستبوون بە تێپەڕینی کات و جیاوازی شوێن، وە بە هۆی زاڵبوونی شوێنکەوتن و لاساییکردنەوە وەك دەرەنجامی کۆشەگیری زانایان لە ئیدارەی کۆمەڵگەو کارە سیاسییەکانی و ئەو چەقبەستویی و بێ تواناییەی لایەنی زانستی کە هەندێك بە (داخستنی دەرگای ئیجتیهاد) ناوی دەبات.

تێبینیەکی گرنگ هەیە دەبێت ئاگاداری بین، ئەویش ئەوەیە کە ئەو ئامرازانەی پێغەمبەر (ﷺ) بەکاری هێنا بۆ شەڕکردن لە دژی قورەیش یەکسەر دوای ئەوەی گەشتە مەدینە و دەوڵەتی سەربەخۆی تێدا دامەزراند، ئەوە دەگەیەنێت کە زانیاری هەبووە بەو ئامرازو شێوازانە کاتێك لە مەککە بووە، کاتێك بەکاری نەهێناون لەبەر نەزانین و بێتوانایی نەبووە، بە تیرۆرکردنی دوژمنیشەوە، بەڵام دیارە نەکردنی ئەو شتانە لە مەککە مەبەستێکی لە پشتەوە بووە، هی ئەوە نەبووە کە پێغەمبەر (ﷺ) پیاوی دەست نەکەوێت، بەڵکو ئەو موسڵمانانەی تووشی ئازار و ئەشکەنجە دەهاتن ئەوەندە ئیماندار بوون هەتا بوێرن بە ئاشکرا کەسانی وەك ئەبو جەهل و ئەبو سوفیان بکوژن.

---

[٩] لێرەدا قسەکانی نووسەر بۆنی ئەوەی لێ دێت کە باوەڕی بە (نسخ) نەبێت، چونکە کەسانێك هەن باوەڕیان بە هەڵوەشانەوەی حوکمی ئایەتەکانی قورئان نییە ئەگەر بە ئایەتی تریش بێت، تەفسیری تریان هەیە بۆ ئایەتەکان، وەك دەبینین نووسەر جیاوازی حوکمەکان دەگێڕێتەوە بۆ جیاوازی بارودۆخ نەك ئەوەی دژایەتی هەبێت لە نێوان دەقەکاندا و پێویست بەوە بکات بڵێین ئەوەی دواتر حوکمی پێشتری هەڵوەشاندۆتەوە.

پرسیارە گرنگەکە ئەوەیە: حیکمەت چییە لە ڕێگریکردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ موسڵمانان کە بەرپەرچی دوژمنایەتی قورەیش بدەنەوە لە مەککەدا، ئەی بۆ ڕێگای پێدان لە مەدینەدا دوای ئەوەی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیانی دروست کرد کە بەرپەرچی دوژمنایەتی قورەیش بدەنەوەو شەڕیان لەگەڵ بکەن؟ ئەی بۆ جارێکی تر ڕێگری لە موسڵمانان دەکات کە پەنا بەرنە بەر توندوتیژیی یان مامەڵەی هاوشێوە لە توندوتیژییدا لە کاتی فیتنە و ململانێی سیاسیی لە مەدینەدا؟

ئەگەر سەیری هەڵوێستە قورئانیەکان و هەڵوێستەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بکەین لە کاتی مەککەدا، دەبینین فەرمانکردنی موسڵمان بە بەکارنەهێنانی توندوتیژیی لە نێوان ئەوان و سەرکردەکانی قورەیش، بەو پێیە موسڵمان نابێت بەرپەرچی هەڵسوکەوتی دوژمنکارانەیان بداتەوە، هەڵوێستێکی مەبدەئی واجب بوو، واتە لە بنەما جێگیرەکانی بانگەواز و مەنهەجی گۆڕان و چاکسازیی بوو لە ناو ئەو کۆمەڵگەیەی کە موسڵمان بەشێك بوون تێیدا، ئەوەش سیاسەت نەبوو، شتێك نەبوو بۆ بارودۆخێکی کاتی هەڵیبژێرن و بە گوێرەی گۆڕانی بارودۆخی ململانێی سیاسیی بگۆڕێت.

شتێکی تر کە یارمەتیدەرە بۆ تێگەشتنی هەڵوێستی قورئان و مەنهەجی پێغەمبەر (ﷺ) لە ئیدارەی ململانێی ناو مەککە و جیاوازی ئیدارەی ململانێی سیاسیی لە نێوان مەککە و مەدینە، ململانێ لە مەککەدا ململانێیەکی سیاسیی ناوخۆیی بوو لە بەرزترین ئاستی سیاسەتدا لەو کۆمەڵگەیەدا، کاتێك ڕێبەرانی دەسەڵاتی مەککە ویستیان ئەو کۆمەڵە چاکسازیخوازە دامرکێننەوەو لە ناویان بەرن بە هێز، هەڵوێستی قورئانی و پێغەمبەر لەو کاتەدا لە مەککە هەڵوێستێکی مەبدەئیانە بوو کە سازشی تێدا ناکرێت، بانگهێشتی ئاشکراکردنی بانگەواز بۆ یەکتاپەرستی دەکات و فەرمان بە چاکە و بەرگری لە هەموو جۆرەکانی فەساد و گەندەڵی و ستەم دەکات، لە هەمان کاتدا تەنها ئامرازی ئاشتییانە بەکاردێنێت بۆ

بەرەنگاری کاری دوژمنکارانەی سیستەمی مەککە لە دژی بانگەواز و بانگخوازانی چاکسازی ئیسلامی، بەرزترین ئاستی چاکسازیی سیاسییە کە تێیدا پابەند بوون بە شێوازی ئاشتییانەو ئارامگرتن لە سەر ئەشکەنجە و پەنا نەبردن بۆ توندوتیژیی و هێز لە بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیکاران تێیدا بەرجەستە بوو بوو.

هەربۆیە، گرنگە ئەوە بزانرێت کە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە، کە مەبدەئێکی ئیسلامیی گشتییە، چەند ئاستێکی هەیە، هەندێکی لە سەر ئاستی تاك و هەندێکی لە سەر ئاستی سیاسەتی گشتییە، ئەوەی لە سەر ئاستی تاکە: ئەرکی هەر تاکێکی ئوممەتە کە هەستێت بەو کارە، شێوازەکەشی ئەوەی کە هەستێت بە ئامۆژگاری و یارمەتی و کردنی چاکەو عیبادەتەکان و هاندان لە سەر خورەوشتی جوان و یارمەتی موحتاج و بێ دەسەڵات و هەر کارێك کە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ پاراستنی نیزامی گشتیی و فەرمانڕەوای کۆمەڵگە و هەر شتێك کە سیاسەتی شەرعی لە سەر ئاستی تاك ڕێی پێدەدات لە یارمەتی چاکە کردن و بەرگریکردن لە مافی کەسانی تر و ئادابە گشتییەکان، ئەمانەش بە گوێرەی توانا.

بەڵام لە سەر ئاستی سیاسەتی گشتیی و دەوڵەت، سنوورەکەی لە ئامۆژگاریکردن و وتنی هەقدا دەوەستێت بە بێ توندوتیژیی و تەنها بە شێوازی ئاشتییانە و مەدەنییانە و سیاسییانە، وەك ئیمامی موسلیم و ئەحمەد و ئەوانی تر دەیگێڕنەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمویەتی: (أفضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر)، بەڵام بەکارهێنانی توندوتیژیی لە کاتی ململانێی سیاسییدا لە نێوان نوخبەو ڕێبەرانی کۆمەڵگەدا شتێك نییە لە لایەن تاك یان هەر کۆمەڵێکەوە بڕیاری تێدا بدرێت، بەڵکو شتێکە بە شورای هەموو کۆمەڵگە دەکرێت، هەر کاتێك کۆمەڵێك پەنای بردە بەر توندوتیژیی، بڕیاردان لە سەر ئەو کارە دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتی شەرعیی کە ئەهلی (الحل والعقد) و شوورا ڕێبەرانی ڕای گشتین، لە سەر ئەمانە بە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگەوە پێویستە کە پشتگیری دەسەڵاتی

شەرعی بن لە دژی دەستدرێژیکار و سنوورێکی بۆ دانێن، هەتا دەسەڵاتی شەرعی (ئەهلی حەل و عەقد و شورا)، یان ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن (دەسەڵاتی جێبەجێ کارو یاسادانان و دادگەری) بەرقەرار دەبێت، دەبێت ئەو لایەنەی دەستدرێژیی کراوەتە سەر لە مەککە یان مەدینە یان هەر کۆمەڵگەیەکی تر، ئارام بگرێت هەتا ئەو دەستدرێژییە ئاشکرا دەبێت خەڵکی هەستی پێ دەکەن و ئوممەت و دەسەڵاتی شەرعی سنوورێك بۆ دەستدرێژییەکەی دادەنێن.

(وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) (الحجرات: ٩). واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵی ئیماندار شەڕیان کرد و یەکێکیان ستەمی کرد لەوی تر، شەڕ بکەن لە دژی ستەمکارەکە هەتا دەگەڕێتەوە سەر فەرمانی خودا، ئەگەر گەڕایەوە نێوانیان چاك کەنەوە بە دادپەروەرانە، خوای گەورە دادپەروەری خۆش دەوێت.

ئارامگرتنی لایەنی ستەملێکراو لە بانگخوازان و چاکسازیخوازان هۆکاری ئەوەیە کە دەسەڵات یان کۆمەڵگە، یان ئەهلی (الحل والعقد) ئەهلی شورا بۆ ئەوەی هەستیان بجولێت و بزانن ئەرکی سەرشانیان ئەوەیە کە سنوورێك بۆ ئەو ستەم و دەستدرێژییە دانێن.

بە هەمان شێوە ئەگەر ستەمکردن لە لایەن دەسەڵاتەوە یان پیاوانی دەسەڵاتەوە بوو، دووبارە ئارامگرتن و گرتنە بەری ڕێگاکانی ئاشتی و سیاسیی و مەدەنی دەبێتە هۆی ئەوەی میللەت و ئەهلی شورا و ڕێبەرانی ڕای گشتیی کە خەڵکی گوێیان لێ دەگرن، سۆزیان بجولێت و هەستن بە لابردنی ئەو ستەمە، چونکە پێویست بە توندوتیژیی ناکات هەتا ڕێگا لە دەسەڵات بگرن یان سنوورێك بۆ دەستدرێژیی ئەو دانێن، بەڵکو مانگرتن و بەرگری ئاشتییانەی سیاسییانە بەسە بۆ سنووردارکردنی دەسەڵات و ڕووخاندنی ڕژێمەکەی، چونکە هیچ لایەك بەرگەی مانگرتن و بەرگریی ئوممەت ناگرن.

بەو شێوە ئەگەرچی بانگەواز بۆ چاکسازیی بابەتی فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپەیە، بەڵام واتای ئەوە نییە کە هەمووی یەك سروشت و ئاستی هەیە، کەوابوو ناکرێت تاکەکان یان کۆمەڵەکان لە پرسە سیاسییەکاندا خۆیان بکەن بە بڕیاردەرانی ناشەرعیی و بە توندوتیژیی جەستەی ئوممەت پارچە پارچە بکەن و ببنە چەندەها کۆمەڵی دژ بە یەك بە ناوی فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە و دواتر زەرەریان لە قازانج زیاتر بێت، بەو شێوە ئەوەی لە بابەتی فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە – کە تاکەکان یان کۆمەڵەکان بە شێوازێکی ئاشتییانە دەتوانن پێی هەستن– دەرچوو، چووە بابی سیاسەت و بەرژەوەندیی ئوممەت، دەبێت مامەڵەی پرسی سیاسیی و لە لایەن ئەهلی شوراو ڕێبەرانی سیاسیی ئوممەت لەگەڵ بکرێت، ناکرێت و ڕێپێدراو نییە توندوتیژیی تێدا بەکاربێت، چونکە توندوتیژیی تەنها مافێکی شەرعی هاووڵاتیانە و لە دەستی نوێنەریاندا کە دەسەڵات و ڕێبەرانی ڕای گشتیی و ئەهلی شورادایە بۆ هێنانەدی دادپەروەری و بەرگری  لە ئوممەت و جێگیرکردنی یاساو ڕێسای گشتی، نەوەك بۆ ستەمکردن لە نێوان خەڵکیدا، یان ئامرازی دەستی کۆمەڵێك بێت بۆ زاڵبوون و یەکلاکردنەوەی هەر دووبەرەکیەك لە نێوانیان دروست دەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت:  (يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ) (لقمان: ١٧). لێرەدا لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات کە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە بکات و ئارام بگرێت لە سەر ئەو ناڕەحەتیەی بەو هۆیەوە دروست دەبێت.

(وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) (آل عمران: ١٠٤). واتە: با لە نێوان ئێوەدا هەبێت کۆمەڵێك کە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە بکەن و هەر ئەوانەش سەرفراز دەبن.

(كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْراً لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ) (آل

عمران: ١١٠). واتە: ئێوە باشترین ئوممەتێکن کە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە دەکەن و باوەڕتان هەیە بە خودا.

(كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ) (المائدة: ٧٩). واتە: ئەوان نەهییان نەدەکرد لە کەسێك ئەگەر بە بەرچاویانەوە خراپەی بکرادایە، ئەوەش بە ڕاستی شتێکی زۆر خراپ بوو دەیانکرد[١٠].

ئەگەر سەیری فەرموودەکانی (فیتنە) بکەین کە پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی هاوەڵان دەداتەوە سەبارەت بەو فیتنەو ململانێ سیاسییانەی کە ڕوودەدات لە دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) بە تایبەتی لە مەدینە، دەبینین وەڵامەکانی ڕوون و ڕاشکاوانە هەڵوێستی مەبدەئی مەککەمان وەبیر دێنێتەوە لە بەکارنەهێنانی توندوتیژیی و هێز بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێی سیاسیی نێوان ڕێبەرانی ناو یەك کۆمەڵگە هەتا ئەگەر هەندێك لایەن لە کاتی بانگەواز بۆ چاکسازی و نەهێشتنی ستەم تووشی دەستدرێژیی و ئەشکەنجە بوون، بەڵکو دەبێت لایەنی پەیوەندیدار پەنا بەرێتە بەر ڕێگای ئاشتییانە و سیاسییانە بۆ چارەسەری کێشەکە، دەبێت لایەنی ستەملێکراو مامەڵەی ستەمکار بە جێ بهێڵێت بۆ ئەرکی ئوممەت و دەسەڵاتی شەرعی کە لە ڕێبەرانی میللەت و ئەهلی (الحل والعقد) و ئەهلی شورا خۆی دەبینێتەوە هەتا ئەو ستەم و دەستدرێژییە نەهێڵن و مافەکان بپارێزن، چونکە ئاشکرایە دووبەرەکی کۆمەڵگە پەرتەوازە دەکات، دەبێت دەسەڵات سنوورێك بۆ ئەو دەستدرێژییە دانێت بە پێی حاڵەتی ستەمکار: جا دەسەڵات ڕێگری لە ستەمکار بکات و نەهێڵێت دەستدرێژیی بکات، یان ئەگەر ستەمکار دەسەڵات بوو، ئەوا چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگە دەبێت وازبێنن لە پشتگیری دەسەڵات و بە شێوازێکی گونجاو کۆتایی بە ستەمی دەسەڵات بێنن، بە هیچ

---

[١٠] بۆ تێبینی خوێنەر: زۆربەی ئەو ئایەتانەی ڕاڤەکەی نووسراوە تەنها ئەوەی لە ئایەتەکەدا مەبەست بووە بە بەڵگە باس بکرێت ڕاڤەی کراوەو بەشەکەی تری ئایەتەکە ڕاڤە نەکراوە (وەرگێڕ).

شێوەیەك ڕێنماییە ئیسلامییەكان و تەوجیهاتەكانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی لێ وەرناگیرێت كە ڕێ بدات یان چاوپۆشی بكات لە ستەم و چەوساندنەوەی بێ دەسەڵاتان یان بانگخوازانی چاكسازی ناو كۆمەڵگە، یان دەستی دەسەڵاتدار بەرەڵا بكات بە ویستی خۆی ستەم بكات، ئەو دەقانەی كە مەبەست لێی ڕێگرتنە لە دروستبوونی فیتنەو دووبەرەكی بە تایبەتی لە لایەن كەسانێك بە مەبەست ئەوە بكەن، دەبێت بە دروستی ڕاڤە بكرێت بە گوێرەی بارودۆخی كات و شوێن.

گرنگە ئاگاداری هەندێك لە بنەما مەنهەجیە تایبەتەكان ببین كاتێك باسی هەندێك لە دەقەكانی فیتنە دەكەین كە هۆكاری هاتنە كایەی ئەو دەقانە، بارودۆخی كات یان شوێن بووە، ئەو دەقانەی پەیوەستن بە ڕەهەندی كات و شوێن، دەبێت لە كاتی مامەڵە لە گەڵیاندا ڕەچاوی ئەوە بكەین، زۆرێك لە فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ) پەیوەستە بە مەكانەتی ئەوەوە وەك سەركردەی ئوممەت لە كاتی دەوڵەتی مەدینەدا، لەبەرچاونەگرتنی ئەو ڕەهەندە كات و شوێنانە دەمانخاتە هەڵەوە لە تێگەشتنی ئەو دەقانەدا.

١ـ یەكەمی ئەو بنەمایانە: (حاكمیة) باڵادەستی بنەما گشتییەكانە، مەبەست لەوەش ئەو پەیوەندیە مەنهەجیەی نێوان ئەو بنەما و مەبدەئە گشتیی و سەرەكیانە و ئەو لق و ڕووداوو حوكمانەی لە خوار ئەوانەوەن، ئەو پەیوەندیە گرنگیەكی زۆری هەیە بۆ تێگەشتن و دەرەنجامەكان. بنەما گشتییەكان ئەوانەن كە كاریگەرییان هەیە لە سەر ڕووداوو كێشەكان كە دەچنە بازنەی ئەوانەوەو لە خوار ئەوانەوەن، واتە ناكرێت تێگەشتنی ڕووداوو كێشەیەك بە شێوازێك بێت پێچەوانە بێت لە گەڵ بنەما گشتییەكاندا و ئەگەر شتێكی وا ڕوویدا دەبێت جارێكی تر بە ڕووداوو بارودۆخ و شتە پەیوەندیدارەكاندا بچینەوە هەتا ڕووە ڕاستەكە دەركەوێت، لە كاتێكدا دەركەوتنی ڕووی ڕاستی ڕوون نەبوو بە ئاسانی بۆ كەسی لێكۆڵەر دەرنەدەكەوت، لەم كاتەدا ڕەچاوكردنی یاسای (استحسان) و مەبەستەكانی شەریعەت دێتە كایەوە.

٢ـ بنەمای (استحسان) ئەو بنەمایەیە كە زانایانی ئوسوڵ بە كاریان هێناوە بۆ زاڵبوون بەسەر كێشەو ناڕوونی حوكم لە كاتێكدا كە لێكۆڵەر بە دڵنییایەوە ناگاتە حوكمێك كە یەكبگرێتەوە لەگەڵ بنەما گشتییەكاندا.

٣ـ ئاگاداری لێكۆڵەر و كەسی زانا لە بارودۆخی ڕووداوەكە لە كات و شوێنی خۆیدا، هەروەها ئەو هۆكارو هەڵوێستانەی دەقەكە پەیوەست بووە پێوەی و ئەو بەرژەوەندیانەی ویستوویەتی بیهێنێتە دی و ئەو زیانانەی ویستوویەتی دووری

بخاتەوە لە ژیانی کۆمەڵگەدا لە سەر ئاستی تاك و کۆمەڵ، کە ئەمانە شتانێکی گرنگن بۆ تێگەشتنی دەق و ڕووداوەکە.

٤ـ زانینی سروشتی کەسەکان لەگەڵ داب و نەریت، ئەمەش پەیوەستە بەوەی کە کەسی لێکۆڵەر تا چەند ئاگاداری خوو نەریت و سروشتی خەڵکی ئەو شوێنەیە کە دەقە شەرعیەکە پەیوەستە پێوەی، چونکە بە هێندەی زانیاری کەسی لێکۆڵەر سەبارەت بە تەبیعەتو سروشتی دەروونی و بارودۆخی کۆمەڵگە و سوننەتەکانی بوونەوەر ئەوەندە تێگەشتنەکە دروست تر و گشتگیر تر دەبێت، بە پێچەوانەوە ئەگەری هەڵەو خراپ تێگەشتن دروست دەبێت، هەربۆیە دەبێت زانیاری و ئاگاداربوون هەمە لایەن بێت و پەیڕوەی مەنهەجێکی گشتگیر و لێکدانەوەیەکی دروست بۆ دەقەکان بکرێت هەتا بە دروستی لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) شارەزا بین و ببێتە ڕێنمونی بۆمان.

ڕەنگە یەکێك لە مەترسیدارترین بەڵاکان کە تووشی موسڵمانان بووە ئەو کەموکوڕییەیە لە پرۆگرامی فێرکردندا کە گرنگی تەنها بە لایەنێك دەدات و ئەمەش وای کردووە پیاوانی هزر و بیریش هەمان کێشەیان بۆ دروست بێت و هەموو ڕەهەندەکان ڕەچاو نەکەن و زۆرێك تەنها ڕەچاوی لایەنێك یان تەنها لایەنی ڕواڵەتی شتەکان بکەن، یاخود لایەنی مێژوویی و سۆزو عاتیفە کاریگەریەکی زیاد لە پێویستی هەبێت لە سەر بڕیارەکانیان.

ئەم پێشەکییە پێویست بوو باس بکرێت بۆ ئەوەی ئاگادار بین لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە تایبەتن بە ڕێکخستنی کاروباری گشتیی لایەنی کۆمەڵایەتی و بەڕێوەبردنی کاروباری حکومەت و ئەو فەرموودانەی پەیوەستن بە فیتنە و توندوتیژیی و ململانێی سیاسیی و فەرموودەکانی فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە، ئەو دەقانەی کە پەیوەستن بەم بابەتانەوە ئەگەر بەشێکیان وەربگیرێن یان پەیوەست نەکرێن بە بنەما گشتییە سەرەکییە قورئانییەکانەوە، یان پەیوەست نەکرێن بە بارودۆخی کات و

شـوێنی ڕوودانـی فەرموودەکـەوە، هـەروەها ئـەو ڕێنماییانـەی پێغەمبـەر (ﷺ) ئاڕاستەی قەومەکەی کردوون بۆ ڕێکخستنی ژیان و وەدەستهێنانی بەرژەوەندیی و دوورخستنەوەی زیان لە کاتی پێغەمبەردا (ﷺ)، ئەمانەش پێغەمبـەر (ﷺ) وەك سەرکردەو سەرۆکی حکومەت ئەنجامی داون، لەبـەر ئـەوە زۆر گرنگـە ئـەم شـتانە لەبەرچاو بگیرێت لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ).

تێنەگەشتنی واقیع و ڕووداوەکان کە فەرموودەکان مامەڵەیان لەگەڵ کردووە و بـۆ ڕێکخـستنی وتـراوە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی لێکۆڵـەر بکەوێتـە هەڵـەو بۆچـوونی دژبەیەك و وەرگرتنـی هەنـدێك بەڵگـەو وەلانـانی هەنـدێکی تـر، هـەروەها هۆکـاری دواکــەوتنی ئوممــەت و خــراپ بــەکارهێنانی ســوننەت و پەرتــەوازەیی هــزر و کۆمەڵگـەی موسـڵمانان بـووە. کـەوابوو زۆر گرنگـە حیکمـەتی ئـەو گـشتگیری و پەیوەست نەبوونەی حوکمـەکانی قورئـان بـە ڕووداوێکـی تایبەتـەوە ئەوانـەی کـە پەیوەستن بە بنەما و مەفهومە گشتییەکان سەبارەت بە فەرمانڕەوایی و سیاسەت بزانین و وردەکاری جێبەجێکردنی واز لێ بهێنین بۆ ئوممەت و گەلانی موسڵمان لـە کات و شوێنی خۆیدا، ئەمە بە پێچەوانەی ئـەو لایەنـە جێگیرانـەی کـە لـە مـرۆڤ و خێزاندا هەیـە لـە سـیفەتی کەسـایەتی و سروشـتی مرۆڤـەکان و پەیوەنـدی نێـوان تاکەکانی خێزان.

گرفتەکـە لەوەدایـە کـە دەقـەکان بهێـنین و تـەنها پاڵپـشت بـە لایـەنی مانـاو زمانەوانی دەقەکە جێبەجێی بکەین بە سەر ڕووداوێکی تردا کە جیـاوازی هەیـە لـە کـات و شـوێن و بارودۆخـدا، ڕەنگـە هـەر ئـەم جیاوازیـە هـۆی ئـەوە بووبێـت کـە خەلیفەکانی ڕاشیدین و گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) نەهییان کـردووە لـەوەی کە لە هەموو شتێکدا و بە بێ ڕەچاوکردنی بـارودۆخ فـەرموودە بکـەن بـە بەڵگـە و وەك چەکێك بەکاری بێن لە ڕووی خەڵکیدا.

بـەو شـێوەیە دەبیـنین هـەموو ئـەو فەرموودانـەی هـاتوون لـەبارەی کاروبـاری فەرمانڕەوایی، سیاسەت، ململانێی سیاسیی، فیتنە، بانگەواز، چاکسازی، هەوڵدان

بۆ پارێزگاری له كۆمه‌ڵگه و ماف و به‌های گشتیی و فه‌رمان به چاكه و به‌رگری له خراپه، ئه‌مانه چه‌ند فه‌رمووده گه‌لێكن كه بارودۆخی كات و شوێنی گرنگیان هه‌یه، په‌یوه‌سته به عه‌ره‌به‌وه له سه‌رتای ئیسلامدا كه كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی هۆزایه‌تی بوون و ناوه‌ڕاستی دوورگه‌ی عه‌ره‌ب له مێژوویاندا شارستانی و ئیمپراتۆریه‌ت و كۆمه‌ڵگه‌ی ڕێكخراویان وه‌ك دراوسێكانی خۆیان نه‌بووه، هه‌ربۆیه به فراوانی دوورگه‌ی عه‌ره‌ب و هه‌موو ئه‌و فه‌رموودانه‌ی مه‌به‌ستی چاككردنی بارودۆخی ئه‌وان و ڕزگاركردنیان له كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی سه‌ره‌تاییه‌وه بۆ كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی پێشكه‌تووی ڕێكخراو ده‌بێت كات و شوێن و مه‌به‌ست له‌و فه‌رموودانه بزانرێت و له چ بارودۆخێكدا ئه‌و فه‌رموودانه وتراون، به پێچه‌وانه‌ی ئه‌و فه‌رموودانه‌ی سه‌باره‌ت به جوله‌كه هاتوون كه دژایه‌تیه‌كی زۆری ئیسلامیان كرد، هه‌روه‌ها ئه‌وانه‌ی سه‌باره‌ت به گاور و صابیئه و مه‌جوس كه شارستانیه‌تیان هه‌بووه.

ساده‌یی ژیانی عه‌ره‌ب و هۆزایه‌تی و مه‌یلی تاكڕه‌وێتی هۆكارن بۆ ئه‌و مامه‌ڵه تایبه‌ته‌ی كه له ڕێنمایی و سیاسه‌ته‌كانی پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) هه‌بووه له به‌ڕێوه‌بردنی عه‌ره‌بدا به مه‌به‌ستی ناچار كردنی ده‌شته‌كیه‌كان بۆ ژیان له كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی مرۆیی و پێشكه‌وتوودا، كه ئه‌مه وا پێویستی كرد له‌و كاته‌دا پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) دژی ئه‌و مه‌یله هۆزایه‌تی و تاكڕه‌وانه و ملنه‌دان بۆ هه‌ر ده‌سه‌ڵاتێك و هه‌ر ڕێكخستنێكی كۆمه‌ڵایه‌تی مرۆیی شارستانی بوه‌ستێت، دژی مه‌یلی هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌و شه‌ڕ و كوشتاری ناو هۆزه‌كان بوه‌ستێت، كه ئه‌م ڕاستییانه له هۆنراوه‌و ئایه‌ته‌كانی قورئاندا به ڕوونی ده‌بینرێن. ئه‌وه‌تا یه‌كێك له شاعیره‌كانیان ده‌ڵێت:

**ومن لم يذد عن حوضه بسلاحه　　　　يهدم و من لا يظلم الناس يظلم**

**و هل انا الا من غزية إن غوت　　　　غويت و إن ترشد غزية ارشد**

واته: هه‌ر كه‌س پارێزگاری له ماڵی خۆی به چه‌كه‌كه‌ی نه‌كات ده‌یڕووخێنن، هه‌ر كه‌س سته‌م له خه‌ڵكی نه‌كات، سته‌می لێ ده‌كه‌ن، منیش له هۆزی (غزيه)ه‌م،

هەرکات هەڵەی کرد منـیش دەیکـەم و هـەر کـات کەوتـە سـەر ڕێـی ڕاسـت منـیش لەگەڵیام.

خوای گەورەش دەفەرمووێت: (إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللّهِ الَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ * الَّذِينَ عَاهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لاَ يَتَّقُونَ) (الأنفال: ٥٥ـ ٥٦). واتە: خراپترینی مەخلوقات لای خوای گەورە کافرانن، چونکە باوەڕ ناهێنن، ئەوانەی کە هەر جارێك پەیمانیان لە گەڵ دەکەیت پەیمانەکەیان دەشکێنن.

هەروەها دەفەرمووێت: (لاَ يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلاًّ وَلاَ ذِمَّةً وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُعْتَدُونَ * فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَنُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ * وَإِن نَّكَثُواْ أَيْمَانَهُم مِّن بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُواْ أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لاَ أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ) (التوبة: ١٠ـ ١٢). واتە: بێباوەڕان لەگەڵ ئیمانداراندا نە خزمایەتی و نە پەیمان دەخوێننەوەو بە ڕاستی ئەوانە دەستدرێژیکارن، جا ئەگەر تەوبەیان کردو نوێژیان کردو زەکاتیان دا ئەوا دەبنە برای ئایینی ئێوە، ئێمە بەڵگە و ئایەتەکانمان بە وردی دەخەینە ڕوو بۆ کەسانێك بیزانن، ئەگەر دوای ئەوەی پەیمانیاندا شکاندیان و تانەیان لە ئایینەکەتان گرت ئەوا شەڕیان لەگەڵ بکەن، چونکە ئەوانە هیچ پەیمانێك ناپارێزن، هەتا واز لەو کارەیان دێنن.

ئەگەر بە وردی سەیری ئەو فەرموودانە بکەین کە سەبارەت بە دروستکردنی کۆمەڵگەی سیاسیی ئیسلامیی عەرەبی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوون، دەبینین زۆر ئاماژەی تێدایە بە سروشتی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگە هۆزایەتیە و مەیلیان بۆ ململانێی و دووبەرەکی و ملنەدان بۆ دەسەڵاتێکی شارستانی ڕێکخراو، ئەو کات بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) لە زۆربەی فەرموودەکانی و ڕێنماییەکانیدا جەخت لە واجبی گوێڕایەڵی فەرمانڕەواو ملکەچبوون بۆی دەکات، هەروەها ڕێگەگرتن لە دەرچوون لە ژێر ڕکێفی

فەرمانڕەوای شەرعی بە هەر بیانویەك بێت، هەرچەندە دوای ئەو هەموو ڕێنمایی و سیاسەتانەی پێغەمبەر (ﷺ) پەیڕەوی کردن بۆ ئەو مەبەستە، هەر لە ژیانی خۆیدا هەندێك هۆز گوێڕایەڵی خۆیان بۆ فەرمانڕەوا شکاندو بە زەقتر لە سەرەتای خیلافەتی ئەبوبەکردا (ڕەزای خوای لێ بێت) دەرکەوت و دژایەتی فەرمانڕەوای شەرعی ئەو کاتەیان کرد.

زۆر گرنگە هەندێك لەو فەرموودانە بێنین و لە ئاماژەکانی کە پەیوەستن بە کات و شوێنەوە تێبگەین، هەروەها لەو هاوسەنگیە بگەین کە فەرموودەکان دروستیان کردووە لە بارودۆخ و پێکهاتەی دەروونی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی ئەو کاتە، هەتا هیچ کێشەیەك لە هزرو تێگشتنماندا نەمێنێت سەبارەت بە مەبەست و مەقاسیدی شەرعی لە کاتی مامەڵە لەگەڵ پرسە سیاسییەکانی کۆمەڵگە بە شێوازێك کە جێگیری ئاسایش و گەشەی بۆ دابین بکات دوور لە توندوتیژیی و فەسادو دەستدرێژیی.

هەندێك لەو فەرموودانە: لە ئوسامەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) سەیری بەشێك لە شاری مەدینەی کرد و فەرمووی: ئەوەی من دەیبینم ئێوە دەیبینن؟ من شوێنەکانی فیتنە لە نێوان ماڵەکانتاندا وەك شوێنی باران دەبینم. (بوخاری گێڕاویەتەوە—١٧٤٥).

هەروەها، ئەبو داود لە ئەبو زەڕەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پپێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی فەرمووم: ئەی ئەبو زەڕ، منیش وتم: بەڵی ئەی پێغەمبەری خودا فەرمانت بەجێیە، فەرموودەکە دەگێڕێتەوەوە تێیدا هاتووە: چی دەکەی کاتێك خەڵکی زۆر دەمرن و قەبرێك بە نرخی بەندەیەك بێت؟ منیش وتم خودا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، یان ئەوەی ئەوان بۆ منی هەڵدەبژێرن، فەرمووی : دەبێت ئارام بگریت، یان ئارام بگرە، دواتر فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ، منیش وتم: بەڵی ئەی پێغەمبەری خودا فەرمانت بەجێیە، وتی: چی دەکەیت کاتێك بەردە ڕەشەکانی مەدینە دەبینیت بە خوێن داپۆشراون؟ وتم: ئەوەی خودا و

پێغەمبەرەکەی بۆم هەڵدەبژێرن، فەرمووی: لەگەڵ ئەوەبە کە تۆ لەوی[11]، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خودا ئەی شمشێرەکەم نەخەمە سەر شانم (ئامادە بم بۆ بەرگری) فەرمووی: کەواتە بەشداریتکرد لەگەڵیاندا، وتم: ئەی فەرمانی چیم پێ دەکەیت؟ فەرمووی: لە ماڵی خۆتدا دەمێنیتەوە، وتم: ئەی ئەگەر هاتنە سەرم بۆ ماڵەوە؟ فەرمووی: ئەگەر ترسایت تیشکی شمشێر کار بکاتە چاوت، جلەکەت بدە بە سەر دەموچاوتدا و تاوانی تۆ و خۆیشی دەچێتە سەر ئەو. (ئەبو داود – ٣٧١٧).

هەروەها، بوخاری لە ئەحنەفی کوڕی قەیسەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (چووم بۆ سەرخستنی ئەو پیاوە[12]، لە ڕێگادا ئەبوبەکرەم[13] پێ گەشت و وتی: بۆ کوێ دەچێت؟ وتم: بۆ پشتیوانی ئەو پیاوە دەچم، وتی: بگەڕێوە، من لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە کە فەرموویەتی: ئەگەر دوو موسڵمان بە شمشێر دژی یەك وەستان، بکوژ و کوژراو دەچنە ئاگرەوە، وتم ئەی پێغەمبەری خودا، ئەمەیان بکوژە ئەی کوژراوەکە بۆچی؟ فەرمووی: چونکە ئەویش سوور بوو لەسەر کوشتنی هاوڕێکەی. (بوخاری– ٣٠).

لە فەرموودەیەکی تردا کە لە (عبدالرحمن کورِی عبد رب الكعبة)ەوە دەیگێڕنەوەو دەڵێت: چوومە ناو مزگەوتەوەو بینیم عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص لە سێبەری کەعبەدا خەڵك دەوریان داوەو منیش چووم لایان دانیشتم، وتی: (لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بوین لە سەفەرێکداو لە شوێنێك لاماندا، هەندێك بە دەوار و هەندێك بە تیرهاویشتن و هەندێ بە ئەسپەکانیانەوە خەریك

---

[11] ڕەنگە مەبەستی گەڕانەوە بێت بۆ ئەو لادێ و شوێنەی کەسوکاری تێدا دەژی و دوور بکەوێتەوە لە فیتنەکە. واتە: لەگەڵ خزمو عەشیرەتەکانی خۆت بە، هەندێك دەڵێن واتە: لەگەڵ ئەمیر و ئیمامی خۆت بە ئەوەی بەیعەتت پێداوە. عون المعبود شرح سنن أبي داود (٣/٢٨٠).

[12] مەبەستی ئیمامی عەلییە، لە هەندێ ریوایەتی بوخاری هاتووە. فتح الباري ٨٦/١.

[13] هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەرە، ناوی نەعیمی کوڕی حاریسەیە.

بوون، کەسێك بانگەوازی کرد کە کۆبنەوەو لای پێغەمبەر (ﷺ)، کۆبووینەوەو فەرمووی: هەموو پێغەمبەرانی پێش من لە سەریان بووە کە ڕێنمونی ئوممەتەکەیان بکەن بۆ ئەو خێرەی دەیزانن و ئاگادرایان بکەن لەو خراپەیەی دەیزانن، ئەم ئوممەتەی ئێوەش لە سەرەتایدا سەلامەتەو لە کۆتاییەکەیدا تووشی بەڵاو چەند شتێك دەبێت پێتان ناخۆش دەبێت و بە خراپەی دەزانن، جا فیتنەی وا دروست دەبێت کە یەکتری تێدا بکوژن و فیتنە دروست دەبێت کە ئیماندار دەڵێت: لەمەدا تیادەچم، فیتنەکە تێدەپەڕێت و دانەیەکی تر دێت و ئیماندار دەڵێت: ئەمەیە (کە من تێیدا لەناو دەچم) ئەمەیە، جا هەر کەس دەیەوێت لە ئاگر بە دوور بێت و بچێتە بەهەشتەوە، با کاتێك دەمرێت باوەڕی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەبێت، بچێت بۆ لای کەسانێك پێیان خۆشە بچێت بۆ لایان، هەر کەس بەیعەتی دا بە ئیمامێك با گوێڕایەڵی بێت بە ئەندازەی توانای خۆی، جا ئەگەر کەسێکی تر هات و  داوای ئیمامەتی کرد بدەن لە ملی، ئەبو زەڕ دەڵێت: منیش لێی نزیك بوومەوەو پێم وت: سوێندت دەدەم بە خودا تۆ ئەمەت لە پێغەمبەر (ﷺ) بیست؟ ئەویش ئیشارەتی بۆ هەردوو گوێ و دڵی کرد و وتی: بەم دوو گوێیە بستوومە و بە دڵ وەرمگرتووە، منیش وتم: ئەی موعاویەی ئامۆزات فەرمانمان پێ دەکات کە پارەکانمان بە ناهەق بخۆین و یەکتری بکوژین، خوای گەورەش دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً) (النساء: ٢٩). واتە: پارە و ماڵی یەکتری بە ناهەق مەخۆن، مەگەر لە ڕێگەی بازرگانی و بە ڕەزامەندی خۆتان بێت، یەکتری مەکوژن خوای گەورە زۆر بە بەزەییە لەگەڵتاندا. ئیتر ماوەیەك بێدەنگ بوو دواتر وتی: ئەگەر فەرمانی بە گوێڕایەڵی خودا کرد تۆش گوێڕایەڵی بە، ئەگەر فەرمانی بە تاوانکردن کرد تۆش بە قسەی مەکە) (موسلیم– ٣٤٣١).

له (موحەممەدی کوڕی نافیع)ەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی عومەر هات بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی مطیع لە کاتی فیتنەی (الحرة)[١٤] لە کاتی یەزیدی کوڕی معاویەدا، ئەویش وتی: پشتییەکی بۆ دانێن، عەبدوڵلا وتی بۆ ئەوە نە هاتووم دانیشم، بەڵکو بۆ ئەوەی فەرموودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە کە دەفەرموێت: (من خلع یدا من طاعة لقي الله یوم القیامة لا حجة له ومن مات و لیس فی عنقه بیعة مات میتة جاهلیة) واتە: هەر کەسێك واز لە گوێڕایەڵی ئەو کەسە بهێنێت کە بەیعەتی پێداوە، لە ڕۆژی قیامەتدا دەچێتە بەردەم پەروەدگار و هیچ بەڵگەیەکی نییە، هەرکەس بمرێت و بەیعەتێك لە گەردنیدا نەبێت، ئەوا مردنەکەی جاهیلیانەیە. (موسلیم: ٣٤٤١).

هەروەها لە ئیبن عەباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەر کەس شتێکی ئەمیرەکەی بە دڵ نەبوو با ئارام بگرێت، چونکە هەر کەس بستێك لە ڕکێفی فەرمانڕەوا دەربچێت و بمرێت ئەوا مردنەکەی جاهیلیانەیە. (متفق علیه)[١٥].

لە فەرموودەیەکی تردا جەریری کوڕی عەبدوڵلا دەڵێت: بەیعەتم دا بە پێغەمبەر (ﷺ) لە سەر نوێژکردن و زەکات دان و ئامۆژگاری کردنی هەموو موسڵمانێك. (متفق علیه).

هەروەها لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: لەسەر هەموو موسڵمانێك پێویستە گوێڕایەڵی ئەمیرەکەی (فەرمانڕەوا) بێت لە کاتی دەوڵەمەندی و هەژاری و لەش سوکی و لەش قورسی و پێناخۆشبوون و لە کاتێکدا کە فەزڵی کەسانی تر دەدرێت بە سەرتدا. (موسلیم: ٣٤١٩)

---

[١٤] ئەو فیتنەیەی کە لە مەدینە روویدا لە سەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویە لە ساڵی (٦٣)ی کۆچی.

[١٥] واتە موسلیم و بوخاری بە یەك دارشتن گێڕاویانەتەوە..

زۆرێك لەم فەرموودانە وێنایەكمان پیشان دەدەن لە بارودۆخی ئەو كۆمەڵگەیە و ئەو قۆناغەی پێیدا تێپەڕ دەبن و پێویستی ملكەچبوون بۆ فەرمانڕەواو دەسەڵاتی گشتیی و بەرەنگاربوونەوەی بۆماوەیی دڕندایەتی و ژیانی توندوتیژیی بیابانی و هۆزایەتی كە پڕ بووە لە مەیلی هەڵگەڕانەوە و دووبەرەكی و پەرتەوازەیی، وە ئەو بارودۆخەی دەكرێت ئەو كۆمەڵگەیە بەرەو ڕووی بێتەوە لە ململانێی سیاسیی كە لە كۆتایی ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) دەستی پێكرد كە لەو هەڵگەڕانەوەدا خۆی بینییەوە لە دژی دەسەڵاتی دەوڵەت و سیستمی كۆمەڵگەی مەدەنی كە لە ناوەڕاست و باشووری دوورگەی عەرەبدا ڕوویدا كە بەشێكی ئەوانە بوون كە خۆیان بە پێغەمبەر لە قەڵەمدا وەك: موسەیلەمەی درۆزن و ئەسوەدی عەنەسی و سەجاح و ئەوانی تر. لەو هەڵگەڕانەوەدا چەندەها هۆز وازهێنان لە گوێڕایەڵی كردنی دەوڵەتیان ڕاگەیاندو زەكاتیان گرتەوەو نەیاندا، كە دواتر لە شەڕی (الردة)دا دووبارە ئەو هۆزانە ناچار كران بێنەوە ژێر ڕكێفی دەوڵەتی ئیسلامییەوە.

واقیعی ئەو كۆمەڵگەیە لەو كاتەدا وای دەخواست كە ڕێنماییەكانی پێغەمبەر (ﷺ) جەخت بكات لە سەر پابەند بوون بە كۆمەڵەوەو بە دەسەڵاتی شەرعییەوەو دوور كەوتنەوە لە ململانێ و دووبەرەكی، وە لە پێش كاری ترەوە گرنگی بدرێت بە جێگیر كردنی بنەڕەتی كۆمەڵگەی نوێی سیستمە شارستانییەكەی، هەروەها بەرەنگاربوونەوەی عەقڵیەتی مەرامە تاكییەكان و پەرتەوازەیی و زاڵبون و دڕندایەتی و پشێوی كە لە ناخی تازەموسڵمانبووەكان و تازە ئاشنا بە كۆمەڵگەی شارستانی نوێی پێكهاتوو لە دەشتەكی و سەرۆك هۆزەكاندا هەیە، بێگومان لە بارودۆخێكی ئاوەها ناسك و پێویستی ئەنجامدانی ئەو كارە گرنگانە بواری ئەوە نییە كە كەلێن والا بكرێت لە بەردەم دروستبوونی گرفتدا.

له دایکی سەلەمەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: کەسانێك دەبنە فەرمانڕەوای ئێوە کە کارەکانیان هەندێکی باشن و هەندێکی تری خراپ، جا ئەوەی خراپەکەی پێ ناخۆش بوو ئەوا تاوانی نییە و ئەوەشی بە ئاشکرا ناڕەزایی دەربڕی ئەوە باشتر، بەڵام ئەوەی شوێنیان بکەوێت و ڕازی بێت بەو خراپانە (ئەوا تاوانبارە)، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەی شەڕیان لە گەڵ نەکەین؟ فەرموی نەخێر، هەتا نوێژ بکەن. (موسلیم ٣٤٤٦).

لە ڕیوایەتێکی تردا لە (سەلەمەی کوڕی یەزیدی ئەلجەعفی)ەوە دەگێڕنەوە کە پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کردووەو وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەگەر فەرمانڕەوایەك بوو بە کاربەدەستمان داوای هەقی خۆیان دەکرد بە سەرمانەوە بەڵام مافی ئێمەیان نەدەدا، لەو کاتەدا فەرمانی چیمان پێ دەکەیت؟ ئەویش ڕووی موبارەکی وەرگێڕا، دووبارە پرسیاری کرد و ئەویش ڕووی وەرگێڕا، سێبارە پرسیاری کردەوەو ئەویش ڕووی وەرگێڕا، جارێکی تر پرسیاری کرد ئەم جارە (اشعث بن قیس) ڕای کێشا بەلای خۆیدا، دواتر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: گوێ بگرن و بە قسەیان بکەن، ئەوەی لە سەر ئەوانە خۆیان لێی بەرپرسیارن، ئێوەش بەرپرسیارن بەرامبەر بەوەی لە سەرتانە. (موسلیم ٣٤٣٣) .

لە موسلیمی کوڕی ئەشجەعییەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: باشترینی فەرمانڕەواتان ئەوانەن خۆشتان دەوێن و ئەوانیش ئێوەیان خۆش دەوێت و دوعای خێریان بۆ دەکەن و ئەوانیش بۆ ئێوەی دەکەن، خراپترینیشیان ئەوانەن کە ڕقتان لێیانە و ئەوانیش ڕقیان لێتانە و لەعنەتیان لێ دەکەن و لەعنەتتان لێ دەکەن، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەی لەو کاتەدا شەڕیان لەگەڵ نەکەین؟ فەرمووی نەخێر هەتا نوێژ بکەن، نەخێر هەتا نوێژ بکەن، هەر کەس فەرمانڕەوایەکی هەبوو دەیبینی گوناه دەکات، با ڕقی لەو گوناهکردنەی ببێتەوە، بەڵام با واز لە بەیعەتەکەی نەهێنێت، (موسلیم ٣٤٤٨).

لەم سێ فەرموودەی پێشترەوە دەردەکەوێت کە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری داوە سەبارەت بە زوڵم و ستەم کە ڕەنگە لە دوای خۆی ڕوو بدات لە سەر دەستی دەسەڵاتی گشتی و بە تایبەت لە دورگەی عەرەب، ئەمەش –زانینی ئەگەری ڕوودانی ستەم– دەکرێت بە هۆی تێڕامانی بارودۆخ و پێشهاتەکان و سروشتی خەڵکەکەوە بێت یان خوای گەورە وەحیی بۆ ناردووەو پێ فەرمووە، ئەوەی زۆر جێگای تێبینییە بۆ ئێمە ئەو وەڵامانەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە لە کاتی پرسیارکردنی ئامادەبوواندا دەیدایەوە سەبارەت بە چۆنێتی مامەڵە لەگەڵ ئەو بارودۆخەی دێتە پێش، ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامەکانیدا زۆر جەختی لە سەر کردووە ئەوەیە کەموکوڕی و ستەمی فەرمانڕەوا نەبێتە بیانووی بەکارهێنانی توندوتیژیی لە کۆمەڵگەیەکی هۆزایەتیدا کە پێشتر هەموو دووبەرەکییەکیان بە شەڕ کۆتایی پێ هێناوە، نەبێتە بیانووی شۆڕش و هەڵگەڕانەوەی چەکدارانە.

بەو شێوەیە دەیەوێت ڕێگا بگرێت لە سروشتی شەڕەنگێزانەی ئەو هۆزانە و بەو وەڵامە یەکلاکەرەوانە ئەوەیان پێ ڕادەگەیەنێت کە بیانووی خراپیی فەرمانڕەوا و ستەمیان نەبێتە ئامرازێك بە دەست ئەو هۆزانەوە بۆ هەڵگەڕانەوە، یان توندوتیژیی ببێتە ئامرازی ئیدارەی ململانێی سیاسیی لە کۆمەڵگەیەکی تازەپێگەشتوودا.

کەوابوو وەڵامەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هیچ کات ئەوەی لێ وەرناگیرێت کە بەرەنگاری زوڵم و ستەم نەبێنەوە بە شێوازی ئاشتییانە و هەڵگەڕانەوەی ئاشتییانە و فشار خستنە سەر دەسەڵات و ڕاستکردنەوەی، بەڵکو ئاماژەیە بە مەترسی سروشتی هۆزایەتی و پەنا بردنە بەر توندوتیژیی، ئەوەش کە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری دەدا لە بارەیەوە لە هەڵگەڕانەوەی چەکدارانە ڕوویدا و هەندێك لە هۆزەکانی عەرەب وتیان زەکات نادەین و خۆیان بە بەشێکی جیاواز دەزانی لە دەوڵەت و لە بیانوو بوون بۆ پەنا بردنە بەر توندوتیژیی، بەڵام بەداخەوە ئەوانەی لایەنگرو دارودەستەی فەرمانڕەوا بوون بە نیەتی باشەوە یان بە بێئاگایی یان بە

ناچاری، یاخود لەبەر پلەو پایەو سوودی کەسی، ڕەچاوی کات و شوێن و بارودۆخی دەرچوونی ئەو فەرموودانەیان نەکردووەو بۆ جێگیرکردنی خەڵکانی ستەمکار و تەسلیم بوونی خەڵکی بە لایەنی بەهێز بەکاریان هێناوەو ڕۆڵی ئوممەتیان نەهێشتووە لە بەرەنگاری فەساد و لاداندا.

تێگەشتنی دروستی ئەو فەرموودانە هیچ کات ڕێخۆشکەر نییە بۆ نەهێشتنی بەرەنگاری مەدەنیانە و ئەستۆپاکی فەرمانڕەوایان بەرامبەر ئەو ستەمەی دەیکەن، یان نەهێشتنی ڕۆڵی ئەهلی شورا بێت لە بەکارهێنانی هەموو ئامرازەکانی بەرەنگاربوونەوەی فەساد و ستەم، ئوممەت بە جەماوەر و دەم سپییەکانەوە پێویستیان بە بەکارهێنانی توندوتیژیی نییە بۆ سنووردارکردنی دەستدرێژیی فەرمانڕەواکان، بەڵکو تەنها وازهێنان لە گوێڕایەڵی کردنیان و پشتگیری نەکردنیان بەسە بۆ ئەوەی سیستمی حوکمڕانییان بڕووخێت، ئەمەش پێچەوانە نییە لەگەڵ ئەو ڕاستیەدا ئوممەت و نوێنەرە شەرعییەکانی بۆیان هەیە کە سزای تاوانباران بدەن و تۆڵەیان لێبسەننەوە بە گوێرەی بەرژەوەندیی ئوممەت و سیاسەتی شەرعی، بەڵام گرنگە لێرەدا ئەوە بزانین کە ئەو مافی لێپێچینەوەو سزایە بۆ تاك تاکی کۆمەڵگە و گرووپەکان نییە، چونکە ئەوە دەبێتە پەرتبوونی ئوممەت و تووشی شەلەل بوون و بێ توانایی و لە دەست دەرچوونی توندوتیژیی و دروستبوونی رق و تۆڵەسەندنەوە، ئەمەش وا دەکات پرسە سەرەکیەکان لە بیر بکرێت، کۆمەڵگە دەخاتە نێو گێژاوی توندوتیژیی و دووبەرەکی و پەرتەوازەییەکەوە کە لێی دەرنەچێت، وەك حاڵی موسڵمانانی ئەمڕۆ.

بەم شێوەیە ئەوەی لەو دەقانە وەردەگیرێت ئەوەیە کە واجبە دەست بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە بگیرێت و ملکەچی ڕێسای سستمی مەدەنی بین و ڕێگا بگرین لە هەموو بیانوویەکی هەڵگەڕانەوەو پشێوی و توندتیژیی و دووبەرەکی چەکداری و گەڕانەوە بۆ ژیانی سەرەتایی و هۆزایەتی، چونکە ئامرازەکانی

بەرەنگاربوونەوەی ئاشتییانە بەسە بۆ سەرکەوتنی هەق و چاکسازیی و نەهێشتنی فەساد و دەستدرێژیی، هەروەها باجی بەکارهێنانی ئامرازی ئاشتییانە زۆر کەمترە لە توندوتیژیی بەکارهێنان و بە بێ ئامرازی ئاشتییانە حاڵی ئوممەت چاك نابێت و بارودۆخی جێگیر نابێت.

نابێت موسڵمان گومانی لەوە هەبێت کە ئیسلام دادپەروەری و چاکسازی لە سیستمی حوکمڕانی و دامەزراندنی بنەماکانی فەرمانڕەوایی لە سەر ئەساسی شورای واجب کردووە، هەروەها بەرەنگاربونەوەی زوڵم و ستەمی واجب کردووە، چونکە ئەمانە لە بنەما سەرەکیەکانی ئیسلامن و ئەو مەقاسیدە شەرعیانەن کە لە ئایەتەکانی قورئان و کردەوەی پێغەمبەر (ﷺ) و ڕێنماییەکانیدا بەدی دەکرێن، کە ناکرێ وێنایەکی تەواوی ئیسلام ببینرێت بە بێ ئەو شتانە.

ئیمام ئەحمەد دەگێڕێتەوە پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەرمبەر (ﷺ): چ جیهادێك لە هەمووی خێرترە؟ فەرمووی: (وتەیەکی هەق لای کاربەدەستێکی ستەمکاردا).

عەبدوڵای کوڕی عومەریش (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لەسەر موسڵمان پێویستە گوێڕایەڵ بێت و بە قسەی بەرپرسەکەی بکات لەوەی پێی خۆشە یان پێی ناخۆشە، مەگەر فەرمانی پێ بکرێت بە تاوان، هەرکات فەرمانی پێکرا بە تاوان، ئەو کاتە پێویست ناکات نە گوێڕایەڵ بێت و نە بە قسەی بکات) (متفق علیه).

لە ئەبوبەکرەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ إِلَى اللّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ) (المائدة: ١٠٥). گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو فەرمووی: (ئەگەر خەڵکی ستەمیان لە ستەمکار بینی و ڕێگرییان نەکرد دوور نییە خوای گەورە سزای هەمووان بدات) ئەبو داود و ترمزی بە سەنەدی صەحیح گێڕاویانەتەوە.

لەم فەرموودانەو ئەوانەی پێشتر و لە ژێر ڕۆشنایی ئایەتەکانی قورئان و بنەما گشتییەکانی ئیسلام بێگومان ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئیسلام بە ستەم و دەستدرێژیی ڕازی نییە و داوا دەکات کە بەرەنگاری ببینەوە بە شێوازی دروست، نەك بە کوشتن و سەربڕین و ئەشکەنجە و تەقاندنەوەو کاولکاری بۆ مەبەستی سیاسیی، بە دڵنیاییەوە ئەمە ئەو شێوازە نییە کە ئیسلام قەبوڵی دەکات، بە هەمان شێوە ئەو فەرموودانەی پێشتر باسمان کرد مەبەست لێیان ئەوە نییە کە ئیسلام زوڵم و ستەم ڕێ پێدەدات، بەڵکو ڕێگرتنە لە بیانوو هێنانەوە بۆ پەرتەوازەیی و خوێنڕشتن و ڕێنمایی تاکەکانی ئوممەت دەکات بۆ: دەستگرتن بە کۆمەڵی موسڵمانەوە، کۆنترۆڵکردنی نەفس، پەنابردنە بەر ئامرازی ئاشتییانە و سیاسییانە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ستەم و لادان بە ڕادەربڕین و خۆپیشاندان، بە گوێ نەکردنی کاربەدەستان لە ستەم و تاواندا.

زۆرجار ئەم هۆکارانە لە لایەن جەماوەرەوە بەسە بۆ چاکسازیی سیاسیی، بە تایبەتی ئەگەر دەزگا دەستوورییەکان پاڵپشتی بکەن و پەروەردەی سیاسیی و گرتنەبەری ئامرازە سیاسییەکانیش لە ناو خەڵکیدا ببێتە ئامرازی چارەسەری کێشە، وەك لەو کۆمەڵگانەی کە لە گرنگی ئەو دەزگا دەستووری و پەروەردەییانە تێگەشتوون. ئەگەر وا دانانێین ئەو ئامرازە ئاشتیانە لە بارودۆخێکی تایبەتدا سوودی نەبوو، زوڵم و ستەم بەردەوام بوو، سوڵتانیش لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی خۆیدا سەرکەوتوو نەبوو، لەم کاتەدا بەرپرسیاری ئوممەت و ئەهلی شورا و ڕێبەرانی ڕای گشتیی دێتە کایەوەو دەبێت بەرپرسیارێتی چاکسازی و نەهێشتنی زوڵم و ستەم بگرنە ئەستۆ، گومانیشی تێدا نییە کە نە فەرمانڕەواو نە هیچ گرووپێکی ستەمکاری تر توانای بەرەنگاربوونەوەی جەماوەریان نییە، پێویست ناکات لەم حاڵەتەدا پەنا ببرێتە بەر توندوتیژیی و هێز لە لایەن جەماوەرەوە لە دژی لایەنی ستەمکار بە فەرمانڕەواشەوە، چونکە یان دێنەوە سەر هۆشی خۆیان و واز لە ستەم دەهێنن یان خۆیان ئۆتۆماتیکی هەرەس دێنن، لەم حاڵەتانەشدا

ڕوودانی دەستدرێژیی یان بەکارهێنانی توندوتیژیی لە لایەن تاکێکەوە بە تەنها حیسابی بۆ ناکرێت.

دووبارە جەخت لەوە دەکەینەوە ڕوودانی ستەم و زوڵم لە دوو حاڵەت دەرناچێت: یەکەمیان لە نێوان فەرمانڕەواو کۆمەڵێك لە هاووڵاتیان، دووەمیان لەنێوان کۆمەڵانی ناو کۆمەڵگە خۆیان بە بێ ئەوەی فەرمانڕەوا لایەنێك بێت تێیدا، لە حاڵەتێکدا ستەمەکە لە لایەن فەرمانڕەواوە دەکرا بواری چاکردنی نەبوو، ئەوا لە سەر ئوممەت و ڕێبەرانی ڕای گشتیی پێویستە بە شێوازێکی ئاشتییانە دەنگی ناڕەزایی بەرز بکەنەوەو ئەگەر پێویستی کرد واز بهێنن لە جێبەجێ کردنی فەرمانی فەرمانڕەوا، ئەمەش بەسە بۆ دانانی سنوورێك بۆ کێشەکە، بەڵام ئەگەر ستەم و زوڵم کردن لە نێوان دوو گرووپی ناو کۆمەڵگەدا بوو، ئەوا لە سەر دەسەڵاتی شەرعی و ئوممەت پێویستە ئاشتیان بکەنەوەو ڕێکیان بخەن، بەڵام ئەگەر لایەنی دەستدرێژیکار ملی نەدا بۆ هەق ئەوا فەرمانڕەوا لە سەری پێویستە لایەنی دەستدرێژیکار ملکەچی هەق بکات و سزای تاوانباران بدات بە هەر ئامرازێکی پێویست بە بەکارهێنانی توندوتیژیشەوە، چونکە لە بنەڕەتدا فەرمانڕەوا نوێنەری ئوممەتە ئەگەر خۆی لایەنی ستەمکار نەبێت، ئەگەر وابوو ئەوکاتە ڕۆڵی جەماوەر و ڕێبەرانی ڕای گشتیی دێتە کایەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) (الحجرات: ٩).

ڕێنماییەکانی قورئان و مەنهەجی پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕوونی ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە نابێت پەنا ببرێتە بەر توندوتیژیی وەك ئامرازێکی یەکلاکردنەوەی کێشە سیاسییەکان لە کۆمەڵگەدا، ئەمەش بنەمایەکی سەرەکییە، ئەم بنەمایەش دەبێت لە ویژدانی ئوممەتدا بچەسپێت، ئەوکاتە هیچ گرووپێك ناتوانێت و پێویستیشی پێی نیە پەنا بەرێتە بەر توندوتیژیی بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێی

سیاسیی و ئەگەر کردیشی سەکەوتوو نابێت، ئەمەش مەنهەجی ئاسایش و ئاوەدانی و بەردەوامی دادپەروەری و شوورا و چاکسازییە لە ناو کۆمەڵگەدا.

لە بەر ئەو هۆکارانە گرنگە کە تێگەشتنێکی دروستمان هەبێت بۆ وێنا گشتگیرەکە کە دروست دەبێت لە ژێر ڕۆشنایی ئاماژەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕەچاوکردنی ڕەهەندی کات و شوێن بە تایبەتی لە فەرموودەدا، هەروەها تێگەشتن لە حاڵ و سروشتی ئەوانەی ئایەت و فەرموودەیان بۆ هاتووەو ئەو مەبەستانەی ڕێنماییەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ویستوویەتی بیهێنیتە دی، هەتا بۆمان ڕوون بێتەوە کە ڕێنماییەکانی پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی بووە ڕێگری بکات لە خوێنڕشتن و بەدیهێنانی بەرقەراری سیاسیی و دامەزراندنی نیزام و ئاشتی کۆمەڵایەتی لە سەر بنەمای دادپەروەری و یەکسانی و شورا لە کۆمەڵگەدا.

ئەمە ئەو مەنهەج و تێگەشتنەیە کە بە پوختەی ڕێنمایی قورئان و پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئیدارەی ململانێی سیاسیی و چاکسازیی ناو کۆمەڵگەی مەککە و دواتریش لە مەدینە، ئەو ڕێنماییانەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕایگەیاندووە بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ ئەو ڕووداوە گەورانەی دورگەی عەرەب کە دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوویدا.

بە کورتی ئیسلام ئایینی ئاشتی و برایەتی و بەزەیی و دادپەروەری و یەکسانی و شورا و چاکسازی و هەستکردن بە بەرپرسیارێتییە، نەك وەك ئەرکێکی پێویست و بە گوێرەی یاسا، بەڵکو بە گوێرەی هەستی بەرپرسیارێتیی بەرامبەر بە خودا لە دوارۆژدا، بە هیچ شێوەیەك ڕازی نابێت بە زوڵم و ستەم هەروەك چۆن بوار نادات بە توندوتیژیی بۆ ئیدارەی ململانێی سیاسیی ناو کۆمەڵگە و دەبێت ئەوەی مۆرکی سیاسیی پێوەیە بە سیاسییانە چارەسەر بکرێت و لە ڕێگەی گوزارش و ئامرازە مەدەنییەکان، بەم شێوەیە هیچ هێزێك ناتوانێت ڕووبەڕووی

ئوممەت بێتەوە ئەگەر ئوممەت پشتی تێ بكات و بە مەرجێك ئەم چەمكانە لە ویژدانی هاوولاتیان و كەلتور و پرۆگرامی پەروەردەییدا جێگیر بێت.

گرنگە بۆ سەلامەتی ژیانی سیاسیی و سەركەوتنی ئامرازە مەدەنییەكان بۆ بەدی هێنانی چاكسازی و نەهێشتنی ستەم كە گوتاری سیاسیی چاكسازی ئیسلامی بە نیەتێكی پاكەوە بێتو مەبەستی بەرژەوەندیی ئوممەت بێت بە شێوازێكی جوان هەق ڕوون بكاتەوە و بەرژەوەندییە ئایینی و دنیاییەكان ڕەچاو بكات، هەوڵی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خەڵكی بدات و دوور بكەوێتەوە لە شێوازی خۆ بەگەورە زانین و هەڕەشەو گوزارش كردن لە قەناعەتی كۆمەڵێك یان لایەنێك كە بیانەوێت بە زۆر فەرزی بكەن بە سەر خەڵكیدا، واتە گوتاری چاكسازی ئیسلامیی دەبێت هەڵقوڵاوی خواستەكانی كۆمەڵگە بێت و گوزارش لە پێویستی و بەرژەوەندیی ئەو بكات بەو شێوەیە دەتوانێت پاڵپشتی ئوممەت بە دەست بهێنێت بۆ پاڵپشتی ئامانجە چاكسازی و شارستانییەكانی بە بێ ئەوەی پەنا بەرێتە بەر توندوتیژیی، چونكە سیستمەكان لە كۆتاییدا ڕەنگدانەوەی بیروڕاو قەناعەتی خەڵكە بە باش یان خراپ، هەروەها هیچ سیستمێك ناتوانێت بە پێچەوانەی ئەو بیروڕاو قەناعەتەی ئوممەت بڕوات بەڕێوەو كاروباری جێگیر بێت.

ئەوەی لە مێژوودا ڕوویداوە دروستی بنەما ئیسلامییەكان پشتڕاست دەكاتەوە، ئەو توندوتیژییەی هاوتا لەگەڵ هەندێك شۆڕشدا ئەگەر بە وردی سەیری ڕووداوەكان بكەین دەبینین دەتوانرا ئامانجەكان بهێنرێتە دی بە بێ توندوتیژیی و دەستدرێژیی، كە تەنها هۆكاری هەستی تۆڵەی بێ كۆنترۆڵ بووەو حەزی زیادەڕەوی و كزی هەستی بەرپرسیارێتی و ڕێزی ژیانی مرۆڤایەتی، كە ئەمانە زۆر ئوممەتان باجی گەورە دەدەن بە هۆیانەوە.

ئەگەر شۆڕشی فەرەنسی بە نموونە بهێنینەوە، دەبینین كە بە گرنگترین شۆڕشی چاكسازی لە مێژووی ڕۆژئاوادا دادەنرێت، ئەم شۆڕشە خوێنڕشتن و توندوتیژییەكی زۆری لەگەڵدا بوو لە ناوەوەو دەرەوەی فەرەنسا، كەسانێك

دەبینین کە وەك بەڵگەی زەرورەتی بەکارهێنانی توندوتیژیی باسی دەکەن و توندوتیژیی وەك شتێکی پێویست و مەرجی سەرکەوتنی شۆڕش دایدەنێن، کە ئەمەش لە ڕاستیدا تێکەڵکردنی هۆکار و بەرەنجامە، چونکە هۆکاری دروست بوونی ئەو شۆڕشە، فیکری زانایان و قەناعەتی ئوممەت و ڕازی نەبوون بە چەوسانەوە بوو.

ئەو فیکرو قەناعەتە بوو خەڵکی هێنابویە سەر جادە و ڕژێمی ڕووخاند، وە زۆرێك لەو توندوتیژییەی ڕوویدا هیچ پاساوێکی نەبوو، بەڵکو بە بێ ئەو توندوتیژییانە ئامانجەکان بە دەست دەهاتن و ئەو توندوتیژییانەش دەبێت وەك کەموکوڕی شۆڕشەکە سەیر بکرێت نەوەك وەك ڕووداێك کە ناتوانرێت خۆی لێ لابدرێت، ئەو شۆڕشە زۆر ڕق و کینەی دروستکرد و زۆر توانا و وزەی بە فیڕۆدا، لە ئەنجامدا فەڕەنساو ئەوروپا باجێکی گەورەیاندا، بۆ ئوممەتی ئیسلامیی و بیرمەندی موسڵمان شیاو نییە بکەوێتە هەمان هەڵەوە.

بیرکردنەوە لە پرۆسەی چاکسازی سیاسیی لە کۆمەڵگە هاوچەرخە موسڵمانەکاندا بە بێ توندوتیژیی شتێکی ئاسان نییە، بەڵام ئەگەر بڕوانینە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان، ئەوانەی سەقامگیری سیاسیی و دیموکراسی و بەشداری گەل لە بڕیاری چارەنووسسازدا هەیە لە وڵاتەکانیاندا، دەوڵەت سەرقاڵی جێبەجێکردنی بەرژەوەندیی هاووڵاتیانە لە ڕێگەی دەزگا دەستوورییەکانەوە، ڕێز لە یاسا و مافی هاووڵاتی دەگرێت، ئەوکاتە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە شتێکی ئەستەم نییە.

لە کاتێکدا کۆمەڵگەی موسڵمان نەوەکانی لە سەر بنەمای شورا پەروەردە بکات، ئەو بنەمایەی کە هاوشێوەی سیستمی دیموکراسی ڕۆژئاوایە کە بڕیاری سیاسیی لە سەر بنەمای بەشداری پێکردنی میللەت دەدرێت، لەئیسلامیشدا بە شوراو لە ژێر ڕۆشنایی فەلسەفەی ئیسلامیی و بنەما جێگیرەکانی ئایینی ئیسلام کە سیستمی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەبێت پابەند بێت پێوەی، لەم حاڵەتەدا

شێوازی ئاشتیانەی چاکسازی دەبێتە ڕەوشتی کۆمەڵگە و بواری بەکارهێنانی توندوتیژیی لە ژیانی سیاسییدا نامێنێت.

ئەگەر بمانەوێت کۆمەڵگەیەکی لەو شێوە دروست بکەین کە بە شورا کار بکات و جێگیر بێت و شارستانی بێت، پێویستە لە سەر بیرمەندانی ئیسلامیی زۆر بە ڕوونی و بەبێ پەردەو پەنا بنەمای ڕەتکردنەوەی توندوتیژیی لە ژیانی سیاسیی ئیسلامییدا ڕابگەیەنن، دەبێت کۆمەڵگە بە بیرێکی ڕوونەوە دەست بکات بە چاندنی کەلتوری شورا لە پێش هەموو شتێکی تردا. هەر لە خێزانەوە، دایك و باوك فێری بنەماکانی بکرێن، بزووتنەوە چاکسازییەکان پابەند بن بە بنەماکانی شوراوەو دامەزراوەکانی بە پێودانگی شورا بپێوێت و ئامرازە ئاشتیخوازانەکان لە فیکر و کردەوەکاندا ئاشکرا بێت و شتێکی مەبدەئی بێت، قەناعەتی خێزانی موسڵمان وەك بچووکترین یەکەی کۆمەڵگا ڕۆڵی خۆی لە هاندان و پشتگیری هەوڵی گۆڕانکاری دەدات لە ڕووی سەقامگیری و چاکسازی و ئاوەدانکردنەوە سوودی هەیە، بەڵام ئەوانە هیچی نایەتەدی ئەگەر بێ بنەمای ئاشتی بێت، هەرچەندە دووبارە و سێبارە ببێتەوە.

# پەنانەبردنە بەر توندوتیژیی لە چارەسەری ململانێی سیاسیی ناوکۆمەڵگەی موسڵمان، بنەمایەکی جێگیرە و جێگای ئیجتیهاد نییە

له هەڵوێستی پێغەمبەرەوە (ﷺ) لە مەککە و لە قەدەغەکردنی توندوتیژیی لە مەدینە وەك ئامرازی چارەسەری ململانێی سیاسیی ناو کۆمەڵگەی مەدینە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئیسلام ڕێگە نادات جیاوازی ململانێی سیاسیی ببێتە فیتنەو کێشەیەکی گەورە بە شێوازێك دەسەڵاتداران و ڕێبەرانی ئوممەت نەتوانن چارەسەری بکەن. ئەم چەمکە کە مەنهەجی پێغەمبەری (ﷺ) ڕێکخستووە بە درێژایی سەردەمی مەککە و مەدینە ڕێنیشاندەرمانە بۆ دەرەنجامێکی زۆر گرنگ کە دەبێتە بنەمایەکی سەرەکی ئیسلامیی گشتگیر، ئەویش ئەوەیە کە: ململانێی سیاسیی نێو یەك کۆمەڵگە تەنها بە ڕێگەچارەی سیاسییانە چارەسەر بکرێت و کەسی ستەمکارو دەستدرێژییکەر دەبێت ئاشکرا بکرێت بناسێنرێت لە بەردەم کۆمەڵگەدا، دەبێت ئوممەت و فەرمانڕەوای شەرعی و ئەهلی (الحل و العقد) و شورا و ڕێبەرانی ڕای گشتیی هەستن بە ئەرکی خۆیان لە وەستاندنی ئەو دەستدرێژیە لە هەر سەرچاوەیەکەوە بێت، دەبێت ڕێگریی بکەن و بەرامبەر بە دەستدرێژیی کەر ڕاوەستنەوە یان بە ڕووبەڕووبوونەوە یان وازهێنان لە پشتگیری کردنی هەتا ناچاری دەکەن بە واز هێنان لە دەستدرێژییەکەی. جا ئەگەر فەرمانڕەوا لایەنێك نەبوو لە کێشەو ململانێی سیاسیی ئەوا بە ئاسانی دەتوانێت ڕێگری بکات لە دەستدرێژییەکە، بەڵام ئەگەر فەرمانڕەوا لایەنی دەستدرێژیی کەر بوو، ئەو کاتە ئەرکی وەستاندنی دەستدرێژیی دەکەوێتە سەرشانی ئوممەت و ئەهلی شوراو ڕێبەرانی ڕای گشتیی و بۆیان نییە ئەو ئەرکەی خۆیان پشتگوێ بخەن و دەبێت بە گونجاوترین شێواز ئەو ئەرکە ئەنجام بدەن، ئەگەرنا بە هۆی کەمتەرخەمیەوە بەرپرسیار دەبن، لایەنی ستەملێکراویش – کاتێك لە لایەن فەرمانڕەواوە ستەمی لێکرا– دەبێت لە ڕیگەی ئارامگرتنەوە ڕای گشتیی و بەزەیی ڕێبەرانی ئوممەت بۆ لای خۆی ڕابکێشێت بۆ چارەسەری کێشەکە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ) (العصر: ٣). واتە: ئامۆژگاری یەکتر بکەن بە شوێنکەوتنی هەق و ئارامگرتن.

هەروەها دەفەرموێت: (وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ وَاصْبِرْ حَتَّىَ يَحْكُمَ اللّهُ وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ) (يونس: ١٠٩). شوێن نیگای خودا بکەوەو ئارامبگرە هەتا خوای گەورە حوکمی خۆی دەدات و یەکلای دەکاتەوە...

(وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الأُمُورِ) (آل عمران: ١٨٦). واتە: ئەگەر ئارام بگرن و لە خودا بترسن ئەوە لە کارە گرنگەکانە – کە بە هەموو کەس ناکرێت.

(فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ) (الروم: ٦٠). واتە: ئارامبگرە، پەیمانی خودا ڕاستە و با ئەوانەی ئیمانیان نییە باوەڕت و عەزمت کەم نەکەنەوە.

دەبینین لەم ئایەتانەدا خوای گەورە فەرمان بە ئارامگرتن دەکات، ناکرێت کەسی ستەملێکراو، یاخود کەسی چاکسازیخواز پەنا بەرێتە بەر توندوتیژیی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕکابەرەکەی بە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەخۆ، چونکە لەم کاتەدا دەبێتە ڕکابەر و ناوبژیوان و فەرمانڕەوا لە یەك کاتدا، وە بەرپەرچدانەوەی ستەمەکە بە توندوتیژیی فیتنەو دووبەرەکی و کوشتاری لێ دەکەوێتەوەو سەقامگیری نامێنێت، لە مبارەیەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (خەڵکی کاتێك ستەمکاریان بینی و ڕێگرییان لێ نەکرد، دوور نییە خوای گەورە سزای هەموویان بدات)، واتا ئەگەر بەرپرسان و فەرمانڕەوا بە ئەرکی خۆیان هەڵنەستان ئەو کاتە بەرپرسیارێتی دەکەوێتە سەر شانی جەماوەر و دەبێت ئەوان بەو کارە هەستن.

سیستمە سیاسییە باشەکانی ئەم سەردەمە دامەزراوەو یاساو ڕێسای دروست لە خۆدەگرێت بۆ ڕادەربڕین و بەرپرسیارێتی و بەرەنگاری کێشە لە کاتی لادانی سیاسییدا بە ڕێگەچارەی یاسایی، لە کاتی هەبوونی ئەمانەدا پێویست بە هاندانی ئوممەت ناکات بۆ شۆڕش، شۆڕشیش دەرەنجامەکانی ئاشکرا نین و دەکرێت شتی نەخوازراوی تێدا بێت. تاکە گەرەنتی بۆ دروستی ئەدای سیستمی سیاسیی و سەقامگیری ژیانی خەڵکی ئەوەیە کە بیروباوەڕێکی دروست و دەستوورێکی کارا و

پرۆگرامی پێگەیاندنی ڕێکوپێك هەبێت، چونکە ئەگەر سەرنج بدەینە توندوتیژیی و گرفتەکانی جیهانی ئیسلامیی دەبینین هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خاڵانە.

لە لایەکی ترەوە دەبێت ئەوە بزانین کە پابەند بوون بە ئامرازی ئاشتییانەوە لە کاتی ململانێی سیاسیی نێو یەك کۆمەڵگا و دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی توندوتیژیی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە سروشتی خەڵکانێك کە سەر بە یەك ئوممەتن و سۆزو بەزەیی لە نێوانیاندا هەیە ئەگەرێکی دوورە کە تەنها وەك تەماشاکار بمێننەوە بەرامبەر بە ستەمکردن لە خەڵکانێکی مەزڵوم کە ئارامیان گرتووە لە سەر ئەو ستەمە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، نموونەی مێژوویی زۆر هەیە لە سەر ئەم ڕاستییە.

گرنگە لێرەدا دووبارە باس لەوە بکەین کە بنەمای سەرکەوتنی ئوممەت و جەماوەر و ڕێبەرانی ڕای گشتیی کاتێك کە دەچن بە هاواری کەسانی ستەملێکراوەوە کە بەرەنگاری توندوتیژیی نابنەوە بە توندوتیژیی، بنەمایەکی دروستە هەتا ئەگەر فەرمانڕەوا لایەنی ستەمکار بوو، گومانی تێدا نییە ئوممەت و ئەهلی حەل و عەقد و شورا کاتێك خەڵکێکی ستەملێکراویان بینی هەقی دەستێنن و سەری دەخەن، ئەمە لە کاتێکدایە بە لایەنی کەمەوە ئەو خەڵکە ئاکاری باشیان تێدا مابێت و هەر کات جەماوەر وازی هێنا لە پاڵپشتی دەسەڵات، دەسەڵاتیش دەڕووخێت و نامێنێت، چونکە هەر کەس فەرمان بە تاوانکردن بدات کەس بۆی نییە گوێڕایەڵی بکات.

گەورەترین هەڵەیەك کە ئوممەت بیکات ئەوەیە کە دوو کۆمەڵ شەڕ بکەن و هەردوولا پەنا بەرنە بەر توندوتیژیی و چەك بۆ ناوبژیوانییان، لێرەدا وێنای ستەمکار و ستەملێکراو تێکەڵ دەبێت و خەڵکی ناتوانن بە ئاسانی جیایبکەنەوە، ئوممەتیش لەو حاڵەتەدا ناتوانێت ببێتە لایەنێك بەرگری لە کێ بکات، تەنها شتێك لە دەسەڵاتیدا بێت چاوەڕوانییە بۆ ئەوەی ئەنجامی ئەو دووبەرەکیەی بۆ دەربکەوێت  کە عادەتەن پەرتەوازەیی و ناجێگیری و دواکەوتنە. کەوابوو دەبێت ستەمکار بناسرێت و ئاشکرا بکرێت بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ ستەمەکەی دابنرێت، وە ڕەنگە ئارامگرتن و گەورەیی ستەمەکە و ڕاستی بانگەشەی چاکسازی و هەقانێتی داواکانی مەرجانێك بن بۆ جوڵانی هەستی ئوممەت و هەستان بە ئەرکی خۆیان، هەر بۆیە ئارامگرتن و بەردەوام بوون لە سەر بەکارهێنانی ئامرازە ئاشتییەکان تەنها ڕێگەی دروستە بۆ گۆڕان و نەهێشتنی ستەم و کۆتاهێنانی زنجیرەی فیتنە و توندوتیژیی.

بەم شێوەیە دەبێت ئوممەت ڕۆڵی خۆی ببێنێت لە نەهێشتنی ستەمدا هەتا ئەگەر لایەنی دەستدرێژیکەر فەرمانڕەوا بوو. پێویست بەوە ناکات کە بڵێین بەکارهێنانی هێزی یاسایی لە لایەن فەرمانڕەوای دیاریکراوی ئوممەت بۆ

نەهێشتنی ستەم و تاوان وەك ئەركێكی یاسایی و ڕێسای دادپەروەری و چاكسازی و بۆ پاراستنی ئاسایش و ماف و ژیانی هاووڵاتیان ناچێتە بابی ستەم و خراپەوە، بەڵكو مەبەستی بنەڕەتی دەسەڵات دابین كردنی بەرژەوەندیی هاووڵاتیانە ئەگەر بە بەكارهێنانی هێزیش بێت.

ڕەنگە پرسیارێك دروست بێت ئەویش ئەوەیە ئەی ئەگەر خەڵكانێك كە بانگخوازی چاكسازی و پەیامی ڕاستین و ستەمیان لێكرا لە لایەن هەر كۆمەڵێكەوە بێت فەرمانڕەوا یان لایەنی تر، بەڵام سۆزو بەزەیی ئوممەتیان نەبوو بەڵكو ستەملێكردنیان ویستی هاووڵاتیان بوو وەك گوزارشێك لە وەرنەگرتن و قەبوڵ نەكردنی بانگەوازو داواكیان و پێشێلكردنی مافەكانیان، لەم كاتەدا – كە چاكە لە ناو كۆمەڵگەدا نەماوە– ڕۆڵی كۆچكردن دێتە كایەوە، بەڵام هێشتا بەكارهێنانی توندتیژیی ڕێگەچارەیەكی هەڵەیە كە ئەم كۆمەڵە بەكاری بهێنن، كۆچكردن وەك ڕێگەچارەیەكی گونجاو دێتە كایەوە، چونكە ئارامگرتن لە سەر ستەمی كۆمەلێك بە ڕازی بوونی كۆمەڵگەوە سوودێكی ئەوتۆی نییە مەگەر دوای تێپەڕبوونی ساڵانێكی زۆر كە بارودۆخ و هەندێك هۆكاری دەروونیی كاریگەری هەبێت كە لەو كاتەدا دەركی پێنەكرێت.

# چەند وانەیەک لە مێژووی بزووتنەوەکانی بەرگریی ئاشتیخوازانە و بانگخوازیی:

# شیرین و تاڵ

ئەگەر لایەنی تیۆری ئەم مەفهومە واز لێ بهێنین و بچینە سەر باسی لایەنی کردەیی و سەیری ئەزمونی سەرکەوتووی هەندێك بانگەوازی چاکسازی بکەین لە مێژوودا، بەڵکو لە سەردەمی ئێستاشدا، نموونەی زۆر دەبینینەوە کە ئەم مەفهومە بە دروستی ڕوون دەکاتەوە، بۆ نموونە:

بانگخوازانی ئایینی مەسیحی بانگەوازیان دەستپێکرد دژی هەموو ئەو فەساد و خراپە و ستەمەی کە دەوڵەتی ڕۆمانی دەیکردو لەو بانگەوازەدا ڕێگەی ئاشتیانەیان هەڵبژارد و سوور بوون لە سەری، هەرچەندە ڕژێمی ڕۆمانی بە ئەشکەنجەو کوشتن بەرەنگاریان بوویەوە، بەڵام بانگخوازان بە ئارامگرتن و چاوەڕوانی سەرکەوتن و دەرەنجامی باش ڕووبەڕووی ئەو ئازارو ئەشکەنجە و کوشتنە بوونەوە، ئەم هەڵبژاردنەشیان سیاسەتێکی کاتی نەبوو لە ئیدارەی ململانێی سیاسییدا بتوانن گۆڕانکاری بەسەردا بێنن، بەڵکو بنەمایەکی جێگیر بوو هەڵبژاردنی شێوازی ئاشتیانە بوو. هەربۆیە دەبوو ئەو ڕژێمە لە کۆتاییدا لە بەرامبەر بانگەوازی چاکسازیدا چۆك دابدات و بڕووخێت و هۆکاری مانەوەو بنچینەی دامەزراوەکەی نەمینێت و بانگەوازی مەسیحی چاکسازی سەربکەوێت و یادگاری ئەو ئەزمونە بەرزەی مرۆڤایەتی لە بیرەوەری مێژوودا بمێنێتەوە.

بە هەمان شێوازی ئاشتییانە دەبێنین پیغەمبەری ئیسلام (ﷺ) لە سەرەتای بانگەوازی پەیامەکەیەوە لە شاری مەککە دەستی کرد بە ئاشکراکردنی بانگەوازە چاکسازییە ئیسلامییەکەی لە دژی فەساد و خراپەو بیروباوەڕی پوچی ڕژێمی مەککە، ئەو شێوازە ئاشتییانە — لەگەڵ ئەوەی قوربانیدانەکە زۆر بوو وە دەستدرێژیەکی بێ وێنە کرا لە دژیان— هۆکارێك بوو بۆ کەمکردنەوەی دڕندایەتی ڕژێمی مەککە دژی موسڵمانی قورەیشی خاوەن هۆز،[16] هەروەها هۆکار بوو بۆ

---

[16] دەبینین ئەو ئازار و ئەشکەنجەیەی کە گەشتە حەدی کوشتن توشی موسڵمانان بوو، ئەو کەسانەی گرتەوە کە بەندەو بێکەس بوون و پەیوەندییەکی خزمایەتییان نەبوو لە ناو قورەیشدا نموونەی یاسر و

پشتگیری کردنیان له لایەن بەنی هاشم و هەندێك له سەرکردەکانی مەککەوە، بە هەمان شێوە سوور بوون له سەر ئەو مەنهەجە ئاشتییانەیان هۆکار بوو بۆ ئەوەی کەسانێك ناوداری بەهێزی باشترینی پیاوانی مەککە بچێتە ڕیزیانەوە کە بووە هۆی تێکچوونی شیرازەی ڕژێمی مەککە و درزبردنی بنچینەی دەسەلاّت و دواتر بەرەو ڕووخان چوونی دوای ئەوەی موسڵمانان شوێنی هیجرەتیان دۆزیەوەو پشتیوانیان بۆ دروست بوو له مەدینە.

له سەردەمی نوێیشدا نموونەی بزووتنەوەی ئایینی ئێرانیمان هەیە کە دژی فەسادو خراپەی ڕژێمی پاشایەتی ئێران وەستایەوە، لەو کارەشدا شێوازی ئاشتییانەو مەدەنیانەیان گرتەبەر و بووە هۆی سەرکەوتنیان بە سەر ڕژێمی پاشایەتی ئێراندا، چونکە سوپای ئێرانی خۆی بینیەوە له بەرامبەر هاوولاّتیانی خەڵکی ولاّتەکەی خۆیدا له یەك گۆشت و خوێن، بینی کەسانێك دەکوژێت کە بێ چەکن و بەرگریی ناکەن، خۆی بینیەوە وەك ئامرازێکی تاوانکاری له دژی ئافرەت و خەڵکانی بێ تاوانی مەدەنی، بۆیە له کۆتاییدا ئەو سوپایە – کە بنچینەی ڕژێمی پاشایەتی بوو له هەمان کاتدا بەشێك بوو له هاوولاّتیانی گرێدراو بەیەکەوەی ئێرانی– دەبێت ڕازی نەبێت بە بەردەوامی له کوشتن و خوێن ڕشتندا، دەبێت فەرمانی سەرکردایەتی سیاسیی و سەربازی پێشێل بکات، دواتر ئەو سوپایە ڕووخاو ڕژێمیش له گەڵیدا ڕووخا و بزووتنەوەی گۆڕان و بەرگری سەرکەوت. هۆکاری گرنگی سەرکەوتن ئەو بەرەنگارییە ئاشتییانە بوو کە سوپا پێشبینی نەدەکرد نەوەك پشتێکردنی ئەمریکا بۆ ڕژێمی شا – وەك هەندێك پێیان وانییە–

---

سومەییە و بیلال ڕەزای خوایان لێ بێت. دەکرێت پێشبینی ئەوە بکەین کە چی دەهات بەسەر موسڵمانی خاوەن هۆزی قورەیشی ئەگەر توندوتیژیی و کوشتنیان بەکاربهێنایە لە دژی هەندێك لە تاغوتانی قورەیش کە بە توندی دژی بانگەوازەکە وەستانەوە وەك ئەبو جەهل و ئەبو لەهەب، بێگومان لەو حاڵەتەدا سۆز و بەزەیی خزمایەتیان لە دەست دەدا و پاراستنیان نەدەما و بانگەوازەکەو کۆمەڵگەش تووشی نەهامەتی و کاولکاری دەهاتن.

نەخێر ئەمریکا بۆ ساتە وەختێکیش پشتی نەکردە ڕژێمی شا، بەڵکو ڕژێمەکە ڕووخا لە بەرامبەر ویستی بەرەنگاری ئاشتییانەی گەلی ئێراندا، ئەمەش بە ڕاستی ئەزمونێکی دەوڵەمەندە کە پێویستە لە سەر بیرمەندان و گەلانی موسڵمان بە وردی دیراسەی بکەن.

لە لایەکی ترەوە هەر بنەما لە سەر ئەم پەیڕەوو و تێگەشتنە دەتوانین بڵێین حکومەتی شۆڕشی ئێرانی هەڵەیەکی گەورەی کرد کاتێك کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵکی بێ چەکی کفن لەبەرکراوی نارد بەرەو ڕیزەکانی پێشەوەی سوپای عێراقی کە بێ بەزەییانە لە ناویان بردن، هۆکارەکەش ئەوەیە کە ڕووداوەکە جیاوازە لەوەی پێشوویدا لە نێوان خەڵکی ڕاپەڕیوی ئێران لە دژی شاه، چونکە لەم حاڵەتەی دووەمەدا ڕووبەڕووبوونەوەکە لە نێوان دوو کۆمەڵگە و دەوڵەت و ڕژیمی دژ بە یەکی جیاوازدا بوو کە دەوڵەتی ئیسلامیی ئێران و دەوڵەتی عەلمانی نەتەوەپەرستی عێراقدا بوون، چونکە پەیوەندی نێوان ئەو دووانە پەیوەندی سۆز بەزەیی و نێو یەك کۆمەڵگا نەبوو، بەڵکو پەیوەندی نێوان دوو ڕژێم و دەسەڵاتی جیاواز بوو هاوتا لەگەڵ ئەو ڕق و کینەو دژایەتی ڕەگەز و مەزهەب و ململانێ مێژووییەی هەبووە لە نێو ئەو دوو دەوڵەتەدا. هەربۆیە ئەو شێوازە ئاشتییانە و مەدەنیانە کە دەرەنجامی باشی هەبوو بۆ ناوخۆی ئێران هەمان دەرەنجامی نەبوو لەگەڵ ڕژێمی عێراقیدا.

نموونەیەکی تر کە جێگای تێڕامانە نموونەی بزووتنەوەی ئیسلامیی چاکسازیی تورکیایە، کە یەکێکە لەو بزووتنەوە ئیسلامییانەی شێوازی ئاشتییانەی مەدەنیانەیان گرتۆتە بەر وەك ئامرازی چاکسازی، هیچ کات پەنای نەبردۆتە بەر توندتیژیی و نەیهێشتووە شوێنکەوتووانیشی توندوتیژیی بەکاربهێنن بۆ دروستکردنی چاکسازی، سەرباری ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجە و فشار و لەمپەر دروستکردنەی تووشی هاتن لە سەر دەستی دەسەڵات، کە دواتر بە قازانجی بزووتنەوەکە شکایەوەو لایەنگرانیان زیاتر بوو.

ڕەنگە پابەندبوون بە بەکارنەهێنانی توندوتیژیی لە ململانێی سیاسیی نێو یەك کۆمەڵگا لە لایەن هەندێك لە بزووتنەوە ئیسلامییەکانەوە، وەك بزووتنەوەی چاکسازی ئیسلامیی لە تورکیا، سەرەتایەك بێت بۆ دروستبوونی مەنهەجێکی سیاسیی ئاشتییانەی دروست لە کاری بانگەوازی ئیسلامییدا کە کار بە شورا دەکات و ئارامگر دەبێت و پەنا ناباتە بەر توندتیژیی وەك ئامرازی بەدیهێنانی چاکسازی نێو کۆمەڵگە، بەڵکو سۆز و بەزەیی و ویژدانی کۆمەڵگە وەك پاڵپشتێك بەکار دێنێت و پەنای بۆ دەبات لە کاتی زوڵم و ستەمدا.

دەکرێت نموونەی جەزائیر لە بەرامبەردا ئەو جیاوازیە ڕوون بکاتەوە لە نێوان شێوازی ئاشتییانە وەك بنەمایەکی جێگیر کە بواری گۆڕینی تێدا نییە لە لایەك و خیاراتەکان لە کاتی ئیدارەی ململانێی سیاسیی کە بە گوێرەی ڕا و بۆچوونی کۆمەڵەکان یەکێك لەو ڕێگایانە – ئاشتییانە بێت یان هێزو توندوتیژی – سروشتی ڕووبەڕووبوونەوەکە دەیخوازێت و دەکرێت بەکاربهێنرێت.

کاتێك گەلی جەزائیر گەشتنە ئەو قەناعەتەی کە پێویستە گۆڕان چاکسازی بکەن و ویستی گۆڕانیان هەبوو ڕووبەڕووبوونەوە لە نێوان ئۆپۆزسیۆن و دەسەڵاتدا دەستی پێکرد و ئاماژەکان ئەوەیان دەگەیاند کە ئۆپۆزسیۆن ویستی بەکارهێنانی توندوتیژیی نییە و نایەوێت بکەوێتە ڕووبەڕووبوونەوەی چەکدارییەوە لەگەڵ حکومەتدا و تەنها شێوازی ئاشتییانە دەگرێتە بەر، لە سەرەتاوە ئەمە وای کرد قەوارەی دەسەڵات بلەرزێت و پەرتەوازەیی بکەوێتە نێو ڕیزەکانی سوپاوە، بەڵام کێشەکە کاتێك دەستی پێکرد کە سەرانی ئۆپۆزسیۆن دەستگیر کران و جەماوەر بە بێ ڕابەر مانەوەو کەسێك نەبوو ڕێنمونیان بکات بۆ بەردەوام بوون لە سەر شێوازی ئاشتییانەو دوورکەوتنەوە لە توندوتیژیی، ئەمە وای کرد کۆمەڵانێك لە جەماوەر پەنا بەرنە بەر توندوتیژیی و بەرنگاربوونەوەی چەکداری کە جەزائیری خستە نێو زنجیرەی توندوتیژیی و کاولکاریەوە، لە کۆتاییشدا هەمووان زەرەرمەند بوون نەك کۆمەڵێك بە تەنها.

ئەم نموونەیەی جەزائیر ئەوەمان بۆ دەردەخات کە پابەند بوون بە مەنهەجێکی دیاری کراوەوە – بەکارنەهێنانی توندوتیژیی– لە پەروەردەو کەلتوری نەوەکانی جەزائیردا جێگیر نەبوو بوو، بەڵکو پەنا بردنە بەر توندوتیژیی لە کاتی ئامادەنەبوونی سەرکردەدا شتێکە ئەگەری هەیە و دەکرێت ڕوو بدات و کۆمەڵێك پەنا بەرنە بەر بەکارهێنانی شێوازی چەکداری. هەروەها ئەوەشی خستە ڕوو کە بەکارهێنانی توندوتیژیی لە فیکری بیرمەندان و کەلتوری ئوممەتدا تەنها یەکێکە لە ڕێگەچارەکان بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێی سیاسیی دەکرێت بەکار بێت – ئەگەر لای زۆربەی یان هەموان – قەناعەتیان وابوو ئامانجەکان دێنێتە دی.

شتێکی تر لە مەسەلەی جەزائیردا کە دەبێت باس بکرێت بۆ تێگەشتنی ئەو نەهامەتیە، ئەو ئەزمونە تاڵەی گەلی جەزائیر پێیدا تێپەڕین بۆ ماوەی زیاتر لە سەدەیەك لە سەر دەستی داگیرکەری فەرەنسی کە دڕندەیی و دڵڕەقی و کاری دوژمنکارانەی زۆری تێدا بوو دژی گەلی جەزائیر، ئەو ئەزموونەی کە جەزائیرییەکان زۆر بە توندی گیانی خۆیان فیدا دەکرد لەو شەڕە دڕندانەدا لەدژی داگیرکەر، دەکرێت ئەم ئەزمونە کاریگەری خۆی جێهێشتبێت لە سەر دەروونی خەڵکی لە مامەڵەیاندا بەرامبەر بە زوڵم و ستەم و خراپەکاری بە شێوازێکی زۆر توند، هەتا ئەگەر لایەنی ستەمکار فەرمانڕەوای وڵاتیش بێت کە ئێستا جێگای داگیرکەری فەرەنسییان گرتۆتەوە.

بەڵام ئەزمونە ماڵوێرانکەرەکانی ئەفغانستان و صۆماڵ و کوردستان و کاریگەری دەمارگیری هۆزایەتی و عەقڵیەتی شەڕانی و دەستێوەردانی دەرەکی خاوەن بەرژەوەندی، پێویستی بە لێکۆڵینەوە نییە.

ئەم نموونانەو نموونەی تر زۆرن لە ئێستاو ڕابردووی کۆمەڵگەکانماندا، کە ئەوە ڕوون دەکەنەوە تا چەند پێویستە مەنهەجێك و دیدێکی روون و ئاشکرا هەبێت لە فیکری ئیسلامییدا سەبارەت بە بەکارهێنانی توندوتیژیی لە ناو کۆمەڵگەدا، وە جیاوازی ئەمە لەگەڵ بەکارهێنانی توندوتیژیی لە نێوان کۆمەڵگە

جیاوازەکاندا کە خەڵکانێکی جیاواز فەرمانڕەواییان دەکەن و دووبەرەکی و ململانێ هەیە لە نێوانیاندا، وە گرنگە دەرکی ئەوە بکەین کە دەبێت بە هەموو شێوەیەك پابەند بین بە شێوازی ئاشتیانەوە لە ئیدارەی ململانێی سیاسی ناوخۆدا، چونکە ئەم ڕێگایە کاریگەر ترە و باشترە، هەروەها دەبێت لەوە بگەین کە پرسی فەرمان بە چاکە بەرگری لە خراپە تەنها بەخشین و ئامۆژگاری و هەوڵی چاکە کردنە نەك مۆڵەتێك بێت بۆ هەڵسوکەوت و تەسەرووف کردن لە پشت دەسەڵاتی شەرعی کۆمەڵگەوە.

هەروەها ئەگەر سەرنجی سەقامگیری وڵاتانی دیموکراسی بدەین لە جیهاندا دەبینین هۆکاری ئەو سەقامگیریە دەگەڕێتەوە بۆ مەنهەجی ئاشتییانە لە چاکسازی و گۆڕاندا، بە شێوازێك یەکلاکردنەوەی پرسە گرنگەکان تەنها لە ڕێگەی دامەزراوە دیموکراسیەکان و هەڵبژاردنی گشتییەوە دەبێت نەوەك لە ڕێی ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداریی نێوان گرووپەکان.

پابەند بوون بە شێوازی ئاشتییانەوە بۆ چاکسازیی و گۆڕان ئەگەرچی هەندێك جار ستەم و دەستدرێژیی بێتە ڕێی مەرج نییە لە هەموو حاڵەتەکاندا ڕوودات، بە تایبەتی ئەگەر کۆمەڵگە نەوەکانی پەروەردە بکات لەسەر ئامرازی ئاشتییانە و شورا بۆ ئیدارەی سیاسەتی کۆمەڵگە و ئەمەش لە هزر و ویژدانیاندا جێگیر ببێت، بە پێچەوانەوە توندوتیژیی هەموو کاتێك بەرهەمەکەی دروست بوونی ڕق و کینە و تۆڵە سەندنەوەو فیتنە و ستەمە. هەربۆیە شێوازی ئاشتییانە ئەگەر باجیشی هەبێت کەمترە و بەروبومی هەیە، بەڵام توندوتیژیی باجێکی گەورەی هەیە و ئەو دەرمانەیە کە لە دەردەکە خراپترە، بەرهەمی ئاشتی شیرینەو بەرهەمی توندوتیژیی تاڵ.

گرنگە ئەوە بزانین کە سەقامگیری کۆمەڵگەی موسڵمان و سەرکەوتنی بزووتنەوەکانی چاکسازی تەنها لە ڕێگای دروستکردنی عەقڵیەتی کۆمەڵگەی شوراوە دێتە دی، هەروەها پابەند بوون بە ڕێگەچارەی ئاشتییانە لە کاتی هەوڵی چاکسازی و گۆڕانی سیاسیی.

هەروەها زۆر گرنگە کە دەرك بەوە بکەین کە شورا لە بنەڕەتدا بنەمایەکی مەنهەجی پەروەردەییە کە دەبێت لە هزر و بیری کۆمەڵگەدا جێگیر بێت، وە تەنها شتێکی ئیداری نییە کە دامەزراوەکانی حکومەت بە کاری بێنن و ناوی جیاوازی بۆ دانێن.

وانەیەکی زۆر گرنگی سەرەکی کە دەتوانین فێری بین لەوەی کە باسکرا ئەوەیە کە ناکرێت بە هیچ شێوەیەك توندوتیژیی بەکاربهێنرێت بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی سیاسیی لە ناو یەك کۆمەڵگە و یەك کیانی یەکگرتوودا، لە هەر بارودۆخێکدا بێت، لەم حاڵەتەدا چاکسازی تەنها بە شێوەی ئاشتییانە دەبێت هەوڵی بۆ بدرێت، هەروەها ئەوانەی ستەمیان لێ دەکرێت و ئارامدەگرن، ئەو ئارامگرتنە سۆز و بەزەیی ئوممەت دێنێتە کایەوەو ڕێگری دەکەن لە ستەمکار و پشتگیری لە چاکسازی و سەقامگیری دەکەن، بەڵکو هەر کات ئەو عەقڵیەتە جێگیر بوو لە هزری ئوممەتداو پێیان حەرام بوو کە توندوتیژیی بەکار بێت لە ئیدارەی ململانێی کۆمەڵگە، لەم کاتەدا لایەنە سیاسییەکانی ناو کۆمەڵگە توانایان نییە توندوتیژیی بەکار بێنن، ئەم ڕاستییە لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا سەلمێنراوە.

کاتێك ئێمە هاتینە ئەو قەناعەتەی کە بەکارهێنانی شێوازی ئاشتییانەی مەدەنیانە بە گوێرەی ئیسلام تەنها ڕێگەیە بۆ یەکلاکردنەوەی جیاوازی و ململانێی و کێشەی سیاسیی ناوخۆیی یەك کۆمەڵگەی موسڵمان، نابێت ئەمە تێکەڵ بکەین لەگەڵ ڕووبەڕووبوونەوە و ململانێی نێوان دوو دەوڵەتی سیاسیی سەربەخۆ، چونکە ئەمە ئاستێکی ترە لە ململانێی سیاسیی و دەکەوێتە ژێر کاریگەری دەرەونی و کۆمەڵایەتی و ڕێکخراوەیی جیاوازەوە.

قەوارە سیاسییە سەربەخۆکان ناتوانن گۆڕانێکی سیاسیی فەرز بکەن بە سەر یەکتردا تەنها لە ڕێگەی نوخبەی دەسەڵات و کاربەستانی ئەو وڵات و کۆمەڵگەیەوە نەبێت، چونکە گەلان و ئوممەتەکان شوێنەکەوتەی سەرکردەکانیانن و لە ژێر کاریگەری ئەواندان و پشتگیریان دەکەن لە کاتی قەیراندا، جا هەرکاتێك نەتوانرا لە ڕیگەی ئاشتییانەوە کێشەکان چارسەر بکرێت، ئەوا دەوڵەتان پەنا دەبەنە بەر هەر شێوازێکی تر بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانیان. یەکێك لەو ڕێگایانەش بەکارهێنانی هێزو بەرپاکردنی جەنگە لە دژی بەرامبەر بۆ ناچارکردنی فەرمانڕەوای و کاربەدەستانی ئەو وڵاتەو دواتر کۆمەڵگەکانیان بۆ تەسلیم بوون بە داواکاری لایەنی بەهێز، جەنگ لە کۆن و نوێشدا یەکێك بووە لە ڕێگاکانی یەکلاکردنەوەی کێشەکان لە نێوان ڕژێمە سیاسییە جیاوازەکاندا، ئەویش بە هۆی سروشتی پەیوەندی و ئەو هۆکارانەی کاریگەرییان هەیە لەسەر هەردوولا لە دوو سنووری جیاوازدا.

یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکان کە وا دەکات دەوڵەتێك پەنا بەرێتە بەر هێز بۆ ناچارکردنی دەوڵەتێکی تر ئەوەیە کە هەستی ئینتیماکردنیان بۆ یەکتر نییە، واتا هەست ناکەن کە هیچ لایەکیان بە جۆرێك لە پەیوەندی بەستراوەتەوە بەوی ترەوە، سروشتی پەیوەندی نێوانیان جۆرێك لە دەمارگیری و ڕووبەڕووبوونەوەی تێدایە و بە ویستی نوخبەی دەسەڵات بەکاردەهێنرێت و لە بەرژەوەندیی خۆی و وڵات.

پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) هەر لە سەرەتای بانگەوازەوە سروشتی پەیوەندی نێوان دەوڵەتان و شێوازی گۆڕان تێدا ڕوون دەکاتەوە، هەروەها ئەو کاریگەرییەی کە دەسەڵاتداران هەیانە لەسەر هاووڵاتیان لە زاڵبوون و بەکارهێنانی ویست و ئیرادەیان بە گوێرەی ویستی دەسەڵات و بەرژەوەندییان. هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) نامەی دەنارد بۆ پاشاکانی فارس و ڕۆم و میرەکانی ناوچەکانی تر و بانگی دەکردن بۆ ئیسلام، تاوانی خۆیان و ژێردەستەکانیانی دەخستە ئەستۆی ئەوان ئەگەر وەڵامیان نەبێت و بەربەست بن لە نێوان ژێردەستەکانیان و ئیسلام، ڕێگر بن لەوەی کە هاووڵاتیانیان بە ویستی خۆیان ئایین و بیروباوەڕی خۆیان هەڵبژێرن لەسەر قەناعەت و بێ زۆرلێکردن، ئەم ئازادیەش پێغەمبەر (ﷺ) و دەوڵەتەکەی پابەند بوون پێوەی وەك ڕێزێك بۆ ئیرادەی مرۆڤ و مافی هەڵبژاردنی ئایینی. نموونەی ئەو نامانەی پێغەمبەر (ﷺ) ناردویەتی بۆ پاشاکان ئەمانەن: لە (موحەممەد)ەوە بەندەو پێغەمبەری خودا بۆ (هرقل) گەورەی ڕۆم، سەلام لەو (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ).

کەسەی شوێنی ڕێنمونی دەکەوێت، پاش ئەمە: بانگت دەکەم بۆ ئیسلام، موسڵمان بە، پارێزراو دەبیت، گەر موسڵمان بیت خوای گەورە دوو پاداشتت دەداتەوە، ئەگەر پشتت هەڵکرد ئەوا تاوانی خەڵکانی سادە لە سەر تۆیە (قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) (آل عمران: ٦٤)[١٧].

---

[١٧] محمد حميد الله، مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي و الخلافة الراشدة، الطبعة الرابعة، دار النفائس، بيروت ١٩٨٣، ص ١٠٧-١٠٩. تێبینی ئەو سێ نامەیەی تر کە بە دوای ئەم نامەیەدا دێن هەر لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراون.

واتا: ئەی ئەهلی کیتاب وەرن با لەسەر شتێك ڕێککەوین: با جگە لە الله کەس نەپەرستین و هاوەڵی بۆ دانەنێین، وە هیچ کەس لە ئێمە شتێکی تر جگە لە خودا بە پەروەردگاری خۆی نەزانێت، ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئێوەش بڵێن: دەی شایەت بن ئێمە موسڵمانین.

(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) لە (موحەممەد)ەوە پێغەمبەری خودا بۆ (کیسرا) گەورەی فارس، سڵاو لەو کەسەی ڕێنمونی وەردەگرێت و باوەڕ بە خودا و پێغەبەری ئەو دەهێنێت و شایەتی دەدات کە هیچ خودایەك نییە تەنها (الله) نەبێت و هاوەڵی نییە، موحەممەد بەندەو پێغەمبەری ئەوە، بانگت دەکەم بە بانگی خودا، چونکە من نێردراوی خودام بۆ هەموو سەر زەوی بۆ ئەوەی ئاگاداری بدەم (لِيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّاً وَيَحِقَّ الْقَوْلُ عَلَى الْكَافِرِينَ) (یس: ٧٠). (واتا: بۆ ئەوەی زیندەوەکان ئاگادار بکاتەوەو ئەو پەیمانی سزایەی دراوە بە کافران جێبەجێ بکرێت) ئەگەر ڕازی نەبوویت ئەوا تاوانی مەجوسیەکان لە ئەستۆی تۆدایە.

(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) لە (موحەممەد)ەوە پێغەمبەری خودا بۆ (مقەوقەس) گەورەی (قیبت)، سڵاو لەو کەسەی شوێنی ڕێنمونی دەکەوێت، پاش ئەمە: من بانگت دەکەم بۆ ئیسلام، موسڵمان بە، پارێزراو دەبیت، گەر موسڵمان بیت خوای گەورە دوو پاداشتت دەداتەوە، ئەگەر پشتت هەڵکرد ئەوا تاوانی قیبتیەکان لە سەر تۆیە لەو کەسەی شوێنی ڕێنمونی دەکەوێت.

هەروەها: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) لە (موحەممەد)ەوە پێغەمبەری خودا بۆ (نەجاشی) ئەسحەم گەورەی حەبەشە، سەلام لەو کەسەی شوێنی ڕێنمونی دەکەوێت و باوەڕ بە خوداو پێغەمبەر دەهێنێت، شایەتی دەدات بەوەی کە هیچ خوایەك نییە جگە لە (الله) و هاوەڵی نییە و هاوسەری نییە و موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خودایە، بانگت دەکەم بە بانگی خودا، چونکە من پێغەمبەری خودام و باوەڕ بهێنە پارێزراو دەبێت (قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ

فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) (آل عمران: ٦٤). ئەگەر ڕازی نەبوویت: ئەوا تاوانی مەسیحیەکانی قەومی خۆت لە سەر تۆیە.

بەم شێوەیە دەبینین کە بانگەوازی ئیسلام بۆ ئەوە بووە کە ئازادی هەڵبژاردنی ئایین و بیروباوەڕ بدرێت بە مرۆڤەکان و بە ویستی خۆی شوێنی کام ئایین دەکەوێت ڕێگای بدرێت.

زۆر گرنگە کە سەرنجی ئەوە بدەین ئیسلام هیچ کارێکی داوانەکردووە لە خەڵکانی تر کە خۆی ئەنجامی نەدابێت: هەروەك چۆن داوای کردووە لەو وڵاتانەی کە دەسەڵاتدار تێیدا ستەمکار بووە کە ئازادی هەڵبژاردنی ئایین فەراهەم بێنن بۆ گەلەکانیان، ئاوهاش ئازادی داوە بە خەڵکی ژێردەسەڵاتی خۆی بۆ هەڵبژاردنی ئایین و بیروباوەڕ، ئەو ئازادیەش شوێنکەوتووانی ئایینی جولەکە و مەسیحی و هەتا ئاگرپەرستیشی گرتەوە، بەم شێوە ئیسلام سوننەتێکی تری جوانی هێنایە کایەوە هەتا موسڵمانان دواتر بەو شێوازە مامەڵە لە گەڵ هەموو گەلانی تردا بکەن.

وشەی (کتاب) لە قورئانی پیرۆزدا لە باسەکانی ئەهلی کیتابدا– وەك لە مامەڵەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەردەکەوێت– مەبەست لێی پێگەشتنی فیکریی مرۆڤ و شارستانیەتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکانە، نەوەك وەك هەندێك پێیان وایە کە تەنها شوێنکەوتووانی چەند ئایینێك دەگرێتەوە، هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد کە لە ڕووی بیروباوەڕەوە مامەڵە لەگەڵ فارسەکان کە خاوەنی سیستم و شارستانیەت بوون وەك مامەڵەی جولەکە و گاور بێت، کە ئەو دووانە هەڵگری ئایینی ئاسمانین، بۆیە ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە (کتاب) شارستانیەت و پێگەشتنی فیکری و کۆمەڵایەتی مرۆڤە.[١٨] ئەمەش ئەوەمان بۆ

[١٨] ڕایەك هەیە کە گەلان بە گشتیی لە ئیسلامدا دەبێت ئازادی بیروباوەڕیان پێ بدرێت و ڕایەکی بەهێزە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (لا إكراه في الدين)، لێرەشدا نووسەر مامەڵەی غەیری

ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی هۆزە دەشتەکیە بت پەرستەکان کە لە ژیانێکی سەرەتاییدا دەژیان، هەمان مامەڵەی جولەکە و گاور و ئاگر پەرستیان لەگەڵ نەکراوە، ئەوانەی کە لە دڕندایەتی خۆیان حیساب بۆ هیچ خزمایەتی و پەنادانێك ناکەن، ئەمەش بۆ ڕزگارکردنی ئەو هۆزانە لە ژیانی سەرەتاییەوە بۆ پێگەشتنی کۆمەڵایەتی و شارستانی، ئەمەش هیچ دەرچوونێك نییە لە بنەمای ئازادی بیروڕا، چونکە ئازادی بیروڕا بۆ کەسێکی تێگەشتووی پێگەیشتووە، نەوەك بۆ کەسێك کە پێنەگەشتبێت و توانای ئیدراکی نەبێت لە ڕووی عەقڵ و هەڵسەنگاندنەوە.

وە کاتێك ڕژێمەکانی قەیسەر و کیسراو هاوشێوەکانیان – کە هەرچەندە شارستانی بوون– ڕێگەیان نەدا بە هاووڵاتیانیان کە بە ئازادی بیروڕای خۆیان هەڵبژێرن و ئازار و ئەشکەنجەی ئەوانەیان دا کە ئەو مافەی خۆیان بەکارهێناوەو ئایینێکیان هەڵبژاردووە بە دڵی ئەوان نییە، ڕێگاچارەیەکی تر نەما لە بەردەم دەوڵەتی ئیسلامییدا لە سەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هەتا دەوڵەتەکانی دواتری ئیسلامیی، جگە لە شەڕکردن لە گەڵ ئەو ڕژێمانەدا بۆ ڕووخاندنی یان ناچارکردنی بۆ دابینکردنی ئازادی هەڵبژاردنی بیروباوەڕ بۆ گەلەکانیان، ئیتر ئەو گەلانە سەرپشك بوون لە هەڵبژاردنی ئیسلام یان مانەوە لە سەر ئایینی خۆیان.

بەکارهێنانی هێزو توندوتیژیی لە نێوان سیستمە سیاسییە سەربەخۆکاندا، وەك دەبینین لە هەندێ کاتدا ڕەنگە تەنها ڕێگاچارە بێت بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێ سیاسییەکان لە نێوان دەسەڵاتدارانی هەردوولا.[19]

---

جولەکە و گاور لە بیروباوەڕدا وەك و ئەوان بۆ هۆکاری شارستانیەت و پێگەشتنی فیکریی دەگێڕێتەوە، ئەمەش ئیجتیهادێکی خۆیەتی و بەڵگەی خۆی هەیە وەك دەبینین. (وەرگێڕ).

[19] هەرچەندە بە گوێرەی بنەماکانی نەتەوەیەکگرتوەکان کە شەڕی قەدەغە کردووە وەك ئامرازێکی ڕێپێدراو بۆ چارەسەری کێشە سیاسییەکان، بە پێچەوانەی یاسا نێودەوڵەتییە پێشووەکان، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە ئەو جەنگانەی لە دوای کۆتایی شەڕی دووەمی جیهان و لە ژێر سێبەری نەتەوە یەکگرتوەکاندا ڕوویداوە، زیاترە لە هەر ماوەیەکی هاوشێوەی لە مێژوودا. وە ئەو وڵاتانەی کە

یاساو ڕێکخراو و پەیمانە نێودەوڵەتیەکانی سەردەم هەوڵی ئەوە دەدات کە بنەمای پەیوەندی وڵاتان لە سەر دادگەری و ڕێزگرتنی مافی مرۆڤ بنیات بنرێت. وە هەرچەندە ئەو هەوڵە سەرکەوتوو بێت لە بەدەستهێنانی ئامانجەکانی ئەوەندە پێویستی بەکارهێنانی توندوتیژیی و هێز کەم دەبێتەوە لە نێوان وڵاتاندا بەو هەموو نەهامەتی و شەڕ و بەڵا کە تووشی وڵات و گەلەکانیان دەبێت بۆ چارەسەری کێشە سیاسییەکان.

ئاشتی و ئاسایشی جیهان و ملکەچی وڵاتان بۆ حوکمی یاسا پابەندە بە ڕێژەی پێشکەوتن لە هەستی برایانەی مرۆڤەکان و نێو گەلان، هەروەها فراوانکردنی بازنەی پابەندبوون بە ئەو یاسا و ڕێساو مەفهومە مرۆیی و ئەخلاقییە هاوبەشانەی نێوان مرۆڤەکان، هەرچەندە کەموکوڕی هەبێت لە بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانە، ئەوەندە بوونی هێزو توندوتیژیی لە پەیوەندیەکانی نێو وڵاتاندا دەبێت.

---

زەرەرمەند بوون لێی تەنها وڵاتانی جیهانی سێیەم بوون و وڵاتانی ڕۆژئاوایی تێدا نەبووە، هەموویشی سوتەمەنی شەڕی ساردی نێوان زلهێزەکان و بازرگانی چەك و بەرژەوەندیی وڵاتە گەورەکان بوون.

ئارامگرتن له سەر شتێك واتا بوێری و ئازایەتی و (مصابرة)ش واتا ئەوەی كە توانای ئارامگرتنت زیاتر بێت له بەرامبەرەكەت و زاڵبیت به سەریدا له ڕێگەی ئارامگرتنەوە، ئارامگرتن له لایەن كەسی بانگخوازەوە واتای ئارامگرتن له سەر ناخۆشی و ئەشكەنجە و هەر ناڕەحەتیەك كە لەو ڕێیەدا دێتە ڕێی، بەو ناڕەحەتیانەوە كە له جیهاد و شەڕكردن و بەرەنگاربوونەوەی دوژمن دروست دەبێت.

گرنگە ئەوە بزانین كە ئارامگرتن بەشێكی سەرەكییە له پرۆسەی بانگەوازی هەق و چاكسازی و نەهێشتنی ستەم و دژایەتی له ناو كۆمەڵگەدا، بەرەنگاربوونەوەی ئاشتییانە له لایەن بانگخوازانی هەقەوە واتای ڕزگاربوون نییە له ئازار و ستەم، بەڵكو ئەوە نرخێكە كە بانگخوازانی هەق و چاكسازی له هەموو كاتێدا دەبێت بیدەن، ئەوەی كە پێی دەڵێن بەرەنگاربوونەوەی ئاشتییانە باجەكەی بە شێوەیەكی گشتیی كەمترە له شەڕوشۆڕ، ئەگەر قوربانی ئامانجێكی ئیجابی هەبێت بێگومان دەرەنجامی ئەم جۆرە قوربانیدانەیە كە له كۆتاییدا توندوتیژیی كۆتایی پێ دێنێت و یەكڕیزی و هەق دێنێتە كایەوە، بە گشتیی زیانی كەمترەو بەروبومی زیاترە.

هەربۆیە گرنگە بەرەنگاربوونەوەی ئاشتییانە و قوربانیدان جودا نەكەینەوە وەك بڵێی بەرەنگاربوونەوەی ئاشتییانە پێویستی بە قوربانیدان نییە، بەڵام بێگومان قوربانیدان له بەرەنگاربوونەوەی ئاشتییانەدا جیاوازە له قوربانیدانی توندوتیژیی، چونكە قوربانیدانی ئاشتییانە هەق دەگێڕێتەوەو جێگیری دەكات و كۆتایی بە توندوتیژیی دێنێت، بە پێچەوانەی توندوتیژیی كە له بازنەیەكدا دەخولێتەوەو ڕۆحی هاوكاری و ڕاوێژ ناهێڵێت له كۆمەڵگەداو ئاسایش و سەقامگیری دەخاتە مەترسییەوە.

ئارامگرتن و پشودرێژی تێیدا: كارەكتەرێكی زۆر گرنگە كە دەبێت له هەموو موسڵمانێكدا هەبێت له هەموو حاڵەتەكانی ژیانیدا، له كاتی: خۆشی و ناخۆشی،

بەرەنگاربوونەوەی ئاشتییانەی ناو کۆمەڵگە، لە کاتی بەرگریکردن لە دوژمنێکی دەرەکی لە حاڵەتی شەڕدا، هەروەها لە کاتی: بەرگریکردن لە خودی خۆ، چەوسێنراوان و ستەملێکراوان لە ڕووی جەستە و ناموس و ماڵ و بیروباوەڕ، دوای ئەوەی هەموو ئامرازەکان بە شێوازی ئاشتییانەی وەك ڕێککەوتن و پەیمان لەگەڵ لایەنی ستەمکار شکست دێنێت بۆ کۆتایی هێنان بە ستەم و دەستدرێژییان.

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالْعَصْرِ * إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ * إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ) (العصر: ١ـ ٣).

(وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ) (السجدة: ٢٤).

(فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ) (الأحقاف: ٣٥).

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ) (البقرة: ١٥٣).

(فَاصْبِرْ صَبْراً جَمِيلاً * إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيداً * وَنَرَاهُ قَرِيباً) (المعارج : ٥ـ ٧).

(فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا) (طه: ١٣٠).

(فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ) (الروم: ٦٠).

(ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ) (البلد: ١٧).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:

(وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاء والضَّرَّاء وَحِينَ الْبَأْسِ) (البقرة: ١٧٧).

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) (آل عمران: ٢٠٠).

(وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُواْ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْراً وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ) (البقرة: ٢٥٠).

(وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ) (فصلت: ٣٥).

(وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ) (الأنفال: ٤٦).

هەروەها چەندەها فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هەیە سەبارەت بە ئارامگرتن لەوانە:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (هیچ کەس بەخشیشێکی پێنەدراوە باشتر و فراوانتر لە ئارامگرتن) (متفق علیه).

هەروەها دەفەرموێت: (سەرم سوڕ دەمێنێت لە کاری ئیماندار کە هەمووی خێرە، ئەمەش تەنها بۆ ئیمانداره، هەرکات تووشی خۆشی هات سوپاسگوزار دەبێت و دەبێتە چاکە بۆی، هەر کات توشی ناڕەحەتی هات ئارام دەگرێت و دەبێتە خێر بۆی) (موسلیم ڕیوایەتی کردووه).

هەروەها لە ئیبن مەسعوودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕنەوە دەڵێت: (دەڵێی ئێستا لە بەر چاومە کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) قەومەکەی خۆی لێیان دەداو ئەویش دەیفەرموو: "خودایە لە قەومەکەم خۆشبە چونکە ئەوان نازانن".(متفق علیه).

لە خەبابی کوڕی ئەرەتەوە دەگێڕنەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: هانامان برد بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) دوای ئەوەی تووشی ئەشکەنجەی زۆر بووین لە سەر دەستی موشریکەکان و وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەی دوعای سەرکەوتنمان بۆ ناکەیت؟ فەرمووی: (لە قەومەکانی پێش ئێوەدا پیاویان دەهێنا چاڵێکیان بۆ دەکردو دەیانخستە ناو چاڵەکەو چوار دەوریان پڕ دەکردەوە لە خۆڵ و دواتر بە مشار دەیان کردە دوو کەرتەوە، یان بە شانەی ئاسنین گۆشت و ئێسکیان لە یەك دەکردەوە، ئەوانە هەموو وای لێ نەدەکردن واز لە ئایینەکەیان بێنن، سوێند بە خودا، خوای گەورە ئەم ئاینە سەردەخات هەتا ڕێبوار لە سەنعاوە بچێت بۆ حضرموت تەنها ترسی لە خودا هەبێت، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن) بوخاری ڕیوایەتی کردووه.

له بارەی ئارامگرتنەوە له جیهاد و شەڕدا دەفەرموێت: (خەڵكینە ئاوات مەخوازن بە شەڕکردن، داوا بكەن خودا بتانپارێزێت، هەر كات گەشتن بە دوژمنەكانتان له شەڕدا ئارام بگرن، ئەوەش بزانن بەهەشت له ژێر سێبەری شمشێردایه). بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان كردووه.

بەم شێوەیە دەبینین ئارامگرتن له سەر ناڕەحەتی له نێو كۆمەڵگەیەكدا و له ناو یەك دەوڵەت و گەلی خاوەن پەیوەندی و هەست و سۆزدا شتێكی زۆر پێویسته بۆ داواكردنی ماف و بانگەوازی چاكسازی و بەرنگاربوونەوەی فەساد، هەروەك چۆن پێویسته بۆ بەرگری له دوژمنی دەرەكی دەستدرێژیكەر، بەڵام توندوتیژیی و تەقاندنەوەو كاردانەوەی شێتانەو حەزی تۆڵەسەندنەوه شتانێكن دەبێت خەڵكی له مەترسییان تێبگات، ئارامگرتن و وتەی هەق و یاخیبوونی مەدەنیانه ئامرازی ئاسایش و سەقامگیرین، كەوابوو دەبێت ئارامگرتن و شێوازی ئاشتییانه له ئیدارەی كاروباری سیاسیی ئوممەت ببێته بنەمایەكی فیكری و كۆڵەكەیەك له سیستمی كۆمەڵایەتی و كرۆكی پەروەردەی نەوەی نوێی ئەم ئوممەتە.

شێوازێکی تری پەیوەندی هەیە کە بۆ زۆر کەسان بۆتە جێگای ئیشکال و تێکەڵبوونی تێگەشتن و بنەماکان سەبارەت بە ڕەوایی بەکارهێنانی توندوتیژیی لە یەکلاکردنەوەی ململانێ سیاسییەکاندا.

ئەم جۆرەش ئەو دەسەڵاتدارانەن کە ملکەچی دەوڵەتانی بیانی ترن، باشترین نموونەی ئەو دەسەڵاتانەی کە سەروەری تەواویان نییە و ملکەچی وڵاتە زلهێزەکانی ترن، وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و ناوەڕاستی ئاسیا و ئەفغانستان لە کاتی فەرمانڕەوایی یەکێتی سۆڤیەتدا، هەروەها نموونەی مێژوویی ئەم پەیوەندیە ئەو وڵاتانەی ژێردەستەی پاشایەتی بەریتانیا بوون.

زۆرجار بانگخوازانی چاکسازی لە سێبەری ئەم جۆرە دەوڵەتانەدا تووشی ئازار و ئەشکەنجەی زۆر دەبن و ئەوانیش پەنا دەبەنە بەر توندوتیژیی لە دژی دەسەڵاتدار کە هەر کوڕی ئەو میللەتەیە و لە خۆیانە، بەڵام ژێردەستەی دەسەڵاتی بیانییە، بە مەبەستی نەهێشتنی ئەو زوڵم و ستەمە وە نەهێشتنی بەربەست. لە کاتێکدا توندوتیژیی بەکاردەهێنن و نەوەی کۆمەڵگەکەیان زەرەرمەند دەبێت لەو کارە، هیچ زیانێك بە بەرژەوەندیی بیانی خاوەن بڕیار لە ئەشکەنجەدانی ئەواندا ناگەیەنن، چونکە بە فیعلی لە دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتەدا بوونی نییە.

بە دڵنیاییەوە بەکارهێنانی توندوتیژیی لە لایەن نوخبەی ئۆپۆزسیۆنەوە لە دژی دەسەڵاتی ملکەچی بیانی شتێکی هەڵەیە، چونکە جۆرێکی ترە لە ململانێی چەکداری ناو یەك کۆمەڵگە و یەك ئوممەت کە دەبێتە هۆی سەرقاڵ کردنی ئوممەت بە گشتیی و پەکخستنی ڕۆڵی ئوممەت لە یەکلاکردنەوەو نەهێشتنی ئەو ململانێ ناوخۆییە، کە لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی لاوازی ئوممەت و ئاسانکردنی زاڵبوونی دەسەڵاتی بیانی و گەشتن بە مەرامە سیاسیی و ئابووری و داگیرکاریەکانی بە نرخێکی کەمتر، هەربۆیە دەبێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی ستەمی دەسەڵاتی لەو شێوە ئۆپۆزسیۆن پابەند بیت بە بەکارهێنانی شێوازی

ئاشتییانەوە بۆ کەمکردنەوەی زەرەری ناخۆیی و مانەوەی تواناکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ستەمکاری بیانی کە هیچ پەیوەندیەکی سۆزو بەزەیی نایبەستێتەوە بە تاکەکانی ئەم گەلەوە.

بەم شێوەیە دەبینین بەکارهێنانی توندوتیژیی لە ناوخۆی کۆمەڵگەیەکدا بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێ سیاسییەکانی نێوان دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن شتێکی رێگاپێدراو نییە، چونکە وێناکان تێکەڵ دەبن و شەڕوشۆڕ بۆ هەر لایەك وەك بەرگریکردن لە خۆ دەردەکەوێت و لە پێناوی مانەوە دەبێت بە بێ ئەوەی هۆکاری ڕاستەقینەی ئەو پێکدادانە دەربکەوێت، ئەمەش بە هۆی کاریگەری لایەنی بیانییەوە، بۆ ئەوەی هەقیقەت بشارێتەوەو گرنگی پێنەدرێت. دیارە بەکارهێنانی توندوتیژیی هیچ ئامانجێکی سوودبەخشی نابێت و نە سەربەستی و نە چاکسازی پێنایەتەدی، هەروەك چۆن سوودێکی ئەوتۆی نییە بۆ دەسەڵاتدارانی ملکەچی بیانی تەنها هەندێك بەرماوەو پارەو پول نەبێت، کە ئەویش لە بەرامبەر گوێڕایەڵی فەرماندایە بۆ زیانگەیاندن بە سەرچاوەو دەرامەتی میللەت و قەوارەی سیاسیی وڵات.

یەکێك لەو بزووتنەوانەی پابەندە بە بەکارنەهێنانی توندوتیژیی دژی دەسەڵاتداری ملکەچی بیانی، بزووتنەوەی بەرگری ئیسلامییە لە فەلەستین (حەماس) و تەنها دژی داگیرکەر دەوەستێتەوە بە چەك، ئەمەش بۆ ئەوەی داگیرکەر هەلی ئەوەی نەبێت کە پێکهاتەکانی گەلی فەلەستین بخاتە شەڕێکی ناوخۆییماڵوێرانکەر و بێتە ئاسانکارییەك بۆ داگیرکەر هەتا هەموو مەرجە ستەمکارانەکەی خۆی بسەپێنێت بە سەر فەلەستینییەکاندا، ئەو خاکەی بە هی فەلەستین لە قەڵەم دەدرێت تەنها (٢٢٪)ی خاکی فەلەستینە و پێشتریش بەشەکەی تر لە لایەن داگیرکەری جولەکەوە داگیر کراوە، ئەو خاکەی هەزاران ساڵە لە سەری دەژین پێش ئەوەی تەنها جولەکەیەکیش بوونی هەبێت لەسەر ئەم زەوییەدا، ئەمەش بە یارمەتی وڵاتانی ڕۆژئاوا بە ماڵ و چەکی ئەوان، ئەو

**قەتڵوعامەی ئێستای فەلەستین ڕووداوێکی تری داگیرکەری ڕۆژئاواییمان بیردەخاتەوە، ئەو تاوانە بێ وێنەیەی کە کۆچبەرە ئەوروپیەکان بە یارمەتی ئیمبراتۆریەتە داگیرکەرە ئەوروپیەکانی لە دژی هیندیە سوورەکانی وڵاتی ئەمریکای جارانیان ئەنجام دا، ئێستاش دەیانەوێت لە خاکی فەلەستیندا دووبارەی بکەنەوە.**[20]

---

[20] ڕەنگە هەندێك پێیان وابێت ئەوەی بەسەر هیندیە سوورەکان هات و ئەوەی بە سەر فەلەستینیەکاندا دێت چەند حاڵەتێکی ئیستیسنائین لە مێژووی ڕۆژئاوادا، بە تایبەتی لە ئێستادا دنیایان پڕکردووە لە بانگەشەی دیموکراسی و مافی مرۆڤ. بەڵام ڕووداوە مێژووییەکان و واقیعی ئەمڕۆ ئەو بۆچوونە پوچەڵدەکاتەوەو وا دەخوازێت کە ئاگاداری خۆمان بین و بەردەوام بین لە هەوڵو تێکۆشان بۆ جێگیرکردنی ئاشتی جیهانی دروست و باوەڕێکی مرۆیی گشتگیر بە برایەتی و یەکسانی مرۆڤەکان بۆ هاتنە کایەی دادەگەری و یاسا لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا. مێژووی ڕۆژئاوا لە ناوەرۆکدا ڕەنگدانەوەی دەمارگیری ئەتنیکی و خۆ بە گەورە زانین و بە کەم زانینی ماف و ژیانی خەڵکانی تر و بەکارهێنانی بۆ بەرژەوەندیی خۆیان، ئەم نەفسیەتە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ڕوویداوە لە ئەوروپا لە تاوانی پاکتاوکردنی ئایینی لە دژی مەسیحی و جولەکە و موسڵمان، هەروەها قەتڵوعام کردنی نەتەوە ڕەسەنەکانی ئەفریقا و ئەمریکاو ئوستراليا، هەروەها بۆ داهاتوو کەمینەی ئەو وڵاتانە لە مەترسیدان هەروەك چۆن یابانیەکان لە ئەمریکا لە کاتی شەڕی جیهانی دووەمدا تووشی هاتن. شتێکی نامۆ نییە کە گەلان بە گومانەوە دەڕواننە ئەو گاڵە گاڵانەی وڵاتە ڕۆژئاواییەکان دەیکەن سەبارەت بە دیموکراسی و مافی مرۆڤ و وە وای دەبینن کە تەنها بۆ بەرژەوەندیی خودویستی خۆیانە، چونکە هیچ گران نییە بە لایانەوە کە بە دوو پێوانەی جیاواز شتەکان هەڵسەنگێنن و مادام لە بەرژەوەندیی خۆیانە پشتگیری ڕژێمە فاسیدەکان دەکەن و مافی مرۆڤ پێشێل دەکەن. وە هەموو کات ئامادەن بۆ بە هانا چوونی سەرخستنی ماف و هەق مادام لە بەرژەوەندیی خۆیدا بێت، ئەگەرچی ئەو وڵاتەی تر ببێتە مەیدانی شەڕو بێهێزبوونی گەل، بەڵام جێگیربوونی ئەو، کۆچکردنی کەسانی پسپۆڕ و شارەزا لەو وڵاتانە بۆ لای خۆیان و سوود وەرگرتن لێیان. ئەوەی ئێمە لێرەدا دەبێت ئاگامان لێی بێت و گرنگی پێ بدەین ئەوە نییە کە واز لە شورا بهێنین لە وڵاتانی ئیسلامییدا و واز لە دیموکراسی بهێنن لە وڵاتانی ڕۆژئاوا یان بنەماکانی یەکسانی و لێبوردەیی و دژایەتی دەمارگیری و خودویستی گەلان. بەڵکو هەوڵی تەواو بدرێت بۆ هاتنمە کایەی سیستمێکی نوێی جیهانی کە بتوانێت ئاشتی بەرقەرار بکات و ئاسایشی

ئەوەی لە سەر گۆڕەپانی فەلەستینی ڕوودەدات لە ڕاپەڕین و ملکەچنەکردنی گەلی فەلەستینی بۆ داگیرکەر و پلانەکانی، وای کردووە کە داگیرکەر بپەشۆکێ و پلانەکانی نەیەتە دی لە لەناوبردنی بەرگریی فەلەستینییدا، ئەمەش وای لێ کردن کە لە دەسەڵاتی فەلەستینیی بدەن، چونکە نەیتوانیوەو هاوکاری بە گوێرەی پێویست نەبووە لە لێدانی بەرگریی گەلی فەلەستینییدا، هۆکارێکی تر ئەوەیە کە گەل بە گشتیی لە دەوری بەرگریکاران کۆبونەتەوە، کە ئەمە وای کرد ستراتیژی داگیرکەر بگۆڕێت و لە باتی لێدانی حەماس چەندەها گورزی توندی لە دەسەڵاتی فەلەستینیی وەشاند لە بەرامبەری گورزەکانی حەماسدا، ئەمانە هەموو وای کرد زیاتر پلانە گڵاوەکانی داگیر دەرکەوێت و بکەوێتە بازنەیەکی خولانەوە لە لێدانی داگیرکەر لە لایەن بەرگرییەوە، لە بەرامبەردا ئەویش لە بەرگریی و گەل و دەسەڵاتی فەلەستینیی بدات و بەم شێوەیە بەردەوامە، کە ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی ترس بکەوێتە دڵی تاکەکانی جولەکەو بە فیڕۆدانی توانا ئابوورییەکانی، چونکە ئەم شێوازە تەنها ڕێگەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو زوڵم و ستەمەی داگیرکەر دەیکات، وە پێویستە بۆ دەرکردنی داگیرکەر و بەرگریکردن لەو کەمە زەوییەی ماوە بە دەست فەلەستینییەکانەوە.

ئەگەر بارودۆخی ستەم و زوڵم و دەربەدەر کردن و بێبەشکردن لە مافەکانیان بە بەرچاوی ڕۆژئاواو یارمەتیەوە لە سەر فەلەستینییەکان بەو شێوەیە بمێنێتەوە، دەبێت گەلانی موسڵمان بە گشتیی و بە تایبەتی ئەوانەی چواردەوری فەلەستین و بە تایبەتی تر گەلی فەلەستینی بەردەوام بن لە سەر هەوڵی ڕزگارکردن و خۆ ئامادەکردنی گەلەکانیان بۆ شەڕێکی ڕزگارکەری درێژخایەن. ئەمەش کاتێکە کە

---

تاکەکان بپارێزێت. دەبێت بەردەوام بین لە هەوڵ و تێکۆشان بۆ یەك پێوانەیی و بۆ ئـەوەی ڕۆشـنبیری و تێگەشتنی خەڵکی ببێتە فەلسەفەیەك کـە ئامـانجی دیـاری کـراوی هەیـە لـە برایـەتی و یەکسـانی و لێبوردەیی، ئەو جیاوازیەی مرۆڤـەکانیش هۆکارێکـە بـۆ گفتوگۆیـەکی شارسـتانییانە و پێکـەوەژیان و بەرقەراربوونی یاسا.

گەلانی موسڵمان ئەو ویستەیان هەبێت و بیانەوێت بە جیددی ڕووبەڕووی ئەو دەستدرێژییە بنەوەو فەلەستین ڕزگار بکەن، ئەمەش پەندی مێژووە کە فێرمان دەکات و خوای گەورەش دەفەرموێت: (سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً) (الأحزاب: ٦٢). ئەو کاتە ڕۆژئاوا بە حیساباتی خۆیدا دەچێتەوە لەم نەهامەتیە خۆیناویەداو واز لە هەموو شتێکی خۆی دەهێنێت جگە لە بەرژەوەندیی ڕاستەقینەی ئاشتی و هاریکاری، چونکە تا ئێستاش هیوای ئەوە هەیە کە دادگەری و عەقڵ و حیکمەت جێگای بێتەوە لە سیاسەتەکانی مرۆڤدا.

ئاشکرایە لەم حاڵەتانەدا، حاڵەتی ملکەچبوونی دەسەڵاتی ناوخۆ بۆ دەسەڵاتێکی بیانی، دەبێت توندوتیژیی و هێزو ململانێ لە دژی دەسەڵاتی بیانی بەکار بێت، چونکە خاوەن بڕیاری ڕاستەقینە ئەوە نەوەك دەسەڵاتداری وڵات کە ملکەچی دەسەڵاتە بیانییەکەیە، لەم حاڵەتەشدا ململانێیەکە وەك ململانێی نێوان دوو دەوڵەت و دوو کۆمەڵگەی جیاوازی لێ دێت و بەکارهێنانی توندوتیژیی دەبێتە یەکێك لە ئامرازەکان و بە گوێرەی بەرژەوەندیی دەکرێت بەکار بێت.

بەکارهێنانی توندوتیژیی دژی دەسەڵاتی بیانی نەوەك دەسەڵاتی ژێردەسەتەی ناخۆ، بەکارهێنانی شێوازی ئاشتییانە لە ناوخۆدا دەبێتە هۆی پاراستنی یەکێتی ئوممەت و پشتگیری یەکتر و کەمکردنەوەی زەرەری ناخۆ، لە هەمان کاتدا دژایەتی لایەنی بیانی دەکرێت دەسەڵاتی ناوخۆ بەهێزتر بکات و ڕێژەیەك زیاتر ئازادی و توانای مناوەرەی پێ بدات، لە هەمان کاتدا توانای گەل زیاد دەکات لە بەرەنگاربوونەوەو وەرگرتنەوەی ماف و کەرامەتیان.

جا کاتێك دەڵێین بەکارهێنانی توندوتیژیی لە لایەن خوازیارانی ئازادی و دادگەری لە دژی داگیرکەران شتێکی ڕەوایە مانای ئەوە نییە کە ئیسلام ڕێگای داوە بە هەموو شێوەیەك بەکار بهێنرێت و زیادەڕەوی تێدا بکرێت، بەڵکو دەبێت بە گوێرەی توانا و پێویستی بێت لە سەر بنەمای دادگەری و بەدەستهێنانی

بەرژەوەندیی بێت، هەروەها دەبێت لە کاتی بەکارهێنانی توندوتیژییدا نەفسی خود کۆنترۆڵ بکرێت، ئەمەش واجبێکی شەرعی و ئەخلاقییە.

وەك وتمان بەکارهێنانی توندوتیژیی لە ناو یەك کۆمەڵگەی یەکگرتوودا کە سۆز و بەزەیی بوونی هەیە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا، کارێکی شەرعی نییە و هیچ ئامانجێکی باشی لێ ناکەوێتەوە، بە پێچەوانەوە بەکارهێنانی توندوتیژیی لە دژی داگیرکەر و کەسانی بیانی کە زیان بە وڵات دەگەیەنن، کارێکی ڕەوایە و شێوازی خۆی هەیە و سنووری دیاری کراوی خۆی هەیە و نابێت زیادەڕەوی تێدا بکرێت، بەڵکو بە ڕێژەی پێویست بۆ نەهێشتنی ستەم و زەرەر و بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی، وە هەر کات دوژمنان بە ڕاستەقینەیی مەیلی دادگەری و ئاشتییان کرد ئەوا موسڵمان دەبێت وەڵامیان بداتەوە و ڕازی بێت.

(وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى) (المائدة: ٨).

(وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) (الأنفال: ٦١).

لە لایەکی ترەوە نابێت هەندێك جۆری پەیوەندی نێوان دەوڵەتان هەیە تێکەڵی بکەین بە حاڵەتی ملکەچی، چونکە هەندێك جار پەیوەندی پتەوی دوو لایەنە لە سەر بەرژەوەندیی هەردوولا دەچێتە بابی زاڵبوونی لایەك بە هۆی بەهێزیەوە لە ڕووی سیاسیی و ئابوورییەوە، بەڵام ئەم شتانە لە پەیوەندی نێودەوڵەتیدا هەندێك جار ڕوودەدات.

گومانی تێدا نییە لایەنی بیانی زاڵ هیچ کات گوێ نادات بە زەرەر و زیان کە دەکەوێت لەو لایەنەی ملکەچی ئەمە و بەرژەوەندیی ئەم دەپارێزێت، مادام بەرژەوەندییەکانی ئەم پارێزراوە، بۆیە بەکارهێنانی توندوتیژیی دژی لایەنی ملکەچ لە لایەن ئۆپۆزسیۆنەوە جگە لە سوودی لایەنی بیانی سوودێکی تری نییە.

ڕەنگە کارا کردن و پشتگیری کردنی ئەو بانگەوازانەی مافی مرۆ و کە هەندێك خاوەن ویژدانی زیندوو هەوڵی بۆ دەدەن، یەکەم لایەنێك لە مێژوودا بانگەشەی بۆ

کردووە ئیسلام بووەو جێبەجێی کردووە، ئەمەش دەکرێت هیوایەك بێت بۆ سنووردانان بۆ ئەو هەموو زوڵم و ستەمەی بوونی هەیە.

ئەم وانانە کە لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر و ئەزمونی بەڕێوەبردنی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها ئەزمونە ڕابردووەکان وەردەگیرێن، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە بەکارنەهێنانی توندوتیژیی لە نێو یەك کۆمەڵگای ئیسلامییدا بنەمایەکی جێگیرەو سیاسەت و ستراتیژێکی کاتی نییە، پابەند بوون بەو بنەمایەوە لە کۆتاییدا لە ڕێگای سیاسەت و شوراوە کێشەکان دەگەیەنێتە چارەسەر هەر جۆرێك بن.

تێکەڵکردنی ئەو کێشانەی کە زۆرێك لە موسڵمانان بەکارهێنانی توندوتیژییان بە پێویست زانیوە تێیدا وەك ڕێگەچارەیەك، دەکرێت یەکێك بێت لە سەرەکی ترین هۆکاری داکوتانی ڕەگوڕیشەی پەرتەوازەیی ستەم و شەڕی ناخۆی نێو کۆمەڵگە ئیسلامییەکان بێت، بەڵکو کێشە و زوڵم و ستەمی زیاتر کردووە نەوەك چارەسەری کردبێت.

ئەم بێئاگایی و ناڕوونی و تێکەڵکردن و ناجێگیری لە بۆچووندا سەبارەت بە حاڵەتە ڕێپێدراوەکانی بەکارهێنانی توندوتیژیی و ململانێی سیاسیی کە بیرمەندانی ئیسلامیی تێی کەوتوون، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زۆری ڕووداوەکان و نزیکییان لە یەکەوە، هەروەها گەورەیی ئەو تەحەدیاتانەی ڕووبەڕوویان بۆتەوە، بێتوانایی لە تێگەشتنی گۆڕانکارییەکان و ئاماژە و ڕەهەندەکانی و فراوانبوونی خاکی ئیسلامیی و موسڵمانبوونی گەل و هۆزێکی زۆر بە کەلتوور و هزری جاهیلیانەوە. ئەمەش وای کرد کە نەتوانرێت بە شێوازێکی گشتگیر و مەنهەجێکی ئیسلامیی ئاگاداری گۆڕانکارییەکان بن و هەڵسەنگاندنی مەنهەجیانەی بۆ بکرێت، کە ئەمەش بووە هۆی لەناوچوونی مەنهەجی شورایی ئیسلامیی لە ئاراستەکردنی کۆمەڵگەکان و پەروەردەکردنیان، هەروەها مەنهەجی زانستی جوزئی و بۆماوەی جاهیلی هۆکارێك بووە بۆ ناڕوونی بۆچون و وێناکان و قووڵکردنەوەی ئەو تێکەڵکردنەی نێوان ئەو کێشانەی کە دەکرێت توندوتیژیی تێدا بەکاربێت و سوودی هەبێت وە لە نێوان ئەو کێشانەی کە بەکارهێنانی توندوتیژیی تێیدا ڕەوا نییەو سوودی نییە و بەڵکو زەرەری زیاترە.

کاتێك باسی ململانێی سیاسیی و کۆمەڵایەتی و ئایینی دەکەین، دەبێت ئاماژە بە بابەتی کۆچکردن بکەین، چونکە یەکێکە لە ئامرازەکانی مامەڵەکردن لە گەڵ ململانێی نێوان لایەنەکانی دووبەرەکی.

کۆچکردنی ئایینی یان سیاسیی، جێهێشتنی خاك و نیشتمانە کاتێك سۆز و بەزەیی نامێنێت، یان کاتێك ئازار و ئەشکەنجە دەگاتە ڕێژەیەك ناتوانرێت بەرگە بگیرێت، بێگومان ئەم جۆرە کۆچکردنە جیاوازی هەیە لە گەڵ کۆچکردنی گەشت و مەبەستی ئابووری.

پێغەمبەر (ﷺ) لە بارەی مەبەستی کۆچکردنەوە دەفەرموێت: (هەرکەس کۆچکردنەکەی بۆ لای خودا و بۆ لای پێغەمبەرەکەی بێت ئەوا کۆچکردنەکەی بۆ لای خودا و بۆ لای پێغەمبەرەکەیەتی، وە هەر کەس کۆچکردنی بۆ ماڵی دنیا بێت یان بۆ لای ئافرەتێك بێت بیهێنێت، ئەوە کۆچکردنەکەی بۆ ئەو شتەیە).

کۆچکردنی ئایینی و سیاسیی دەکرێت لە لایەن تاکەکانەوە بێت وەك کاتێك تاك تووشی ئازار و ئەشکەنجەی زۆر دەبێت و سۆز و بەزەییی نامێنێت هەتا فریای بکەوێت، ئەمیش توانای ئارامگرتنی ئەو ئازار و ئەشکەنجەی نییە و ترسی ئەوەی هەیە زیانی پێبگات لە ڕووی ئایین و عەقیدە و فەوتانی ماف و کەرامەتی، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالْوَاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا فَأُوْلَـئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءتْ مَصِيراً * إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلاَ يَهْتَدُونَ سَبِيلاً) (النساء: ٩٧–٩٨). واتا: ئەو کەسانەی فریشتەکان ڕۆحیان دەکێشن لە کاتێکدا تاوانیان کردووەو ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردووە، لێیان دەپرسن چ پلانێکتان هەبوو، یاخود بە تەمای چی بوون؟ ئەوانیش دەڵێن: ژێردەستە بووین، فریشتەکان دەڵێن: ئەی زەوی خودا ئەوەندە فراوان نەبوو تا بتوانن بگوازنەوەو خۆتان ڕزگار بکەن..

ئەم جۆرە کۆچکردنە ئەگەر دەربازکردنی نەفسیش بێت، بەڵام دەکرێت داوایەکی شەرعیش بێت بۆ پاراستنی ئایین و نەفس و کەرامەتی مرۆڤ، وە بەوە دانانرێت کە لە هەوڵی چاکسازی و بەرەنگاربوونەوەی ستەم ڕایکردبێت. کۆچکردنیش دەکرێت بە شێوەیەك بێت کە کۆچکردووەکان چاوەڕوانی کاتێکن کە بارودۆخ بگۆڕێت، ئەمەش وەك ئامرازێکی بەرەنگاربوونەوەی ستەم و ستەمکاران هەژمار دەکرێت، کاتێك لە ژێر دەسەڵاتی ستەمکار دەردەچن و چاوەڕوانی کاتێکی گونجاون بۆ گەڕانەوەو درێژەدان بە بەرەنگاربوونەوەی ستەم و نەهێشتنی، ئەم جۆرەش نزیکە لە پەنابەرێتی سیاسیی ڕۆژگاری ئێستا. نموونەی ئەم کۆچکردنە، کۆچی یەکەم و دووەمی موسڵمانان بوو بۆ حەبەشە، کاتێك پیاوماقوڵانی مەککە و خەڵکی بە گشتیی بانگەوازی ئیسلامیان بە مەترسیەك دادەنا بۆ سەر ئەوان و سۆز و بەزەییان نەما بەرامبەریان و بووە هۆی ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەیە.

دەکرێت کۆچکردن بۆ جیابوونەوەو دژایەتیکردن بێت و خۆ حازرکردن بێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمنان و دانانی سنوورێك لە دەرەوە بۆ فیتنە و پێشێلکردنی ماف و ئازادییەکان، نموونەی ئەم کۆچەش کۆچی موسڵمانان بوو بۆ مەدینە، دوای ئەوەی بێ هیوا بوون کە مەکەییەکان بانگەوازەکەیان قەبوڵ بکەن یان سۆز و بەزەیی پارێزەریان بێت، هەربۆیە کۆچیان کرد بۆ مەدینە هەتا بیکەنە بنکەیەك بۆ دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلام و بەرەنگاربوونەوەی قورەیش، تا ئەو کاتەی سەرکەوتن و ئیسلام سەرکەوت. بەو شێوەیەش ئاسایش لە وڵات و بۆ خەڵکی فەراهەم هات و سەردەمی فیتنە و دەستدرێژیی کۆتایی هات و دەوڵەتی ئیسلام دروست بوو، بارودۆخ وای لێ هات کە پێغەمبەر (ﷺ) گوزارشی لێوە دەکات و دەفەرموێت: (دوای ڕزگارکردنی مەککە کۆچکردن نییە، بەڵام جیهاد و نیەتە). ئەم کۆچکردنەش بە پێچەوانەی کۆچی جولەکە لە دژی گەلی فەلەستین و

داگیرکردنی خاکەکەیان وەدەرنانی خەڵکەکەی کە هەر لە سەرەتاوە لەو خاکەدا بوون.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا زۆرێك لە کۆچکردن لە جۆری خۆ دەربازکردن و چاوەڕوانیکردنە، چونکە کاتێك وڵاتی خۆیان بەجێدەهێڵن دەیانەوێت لەڕێی دەوڵەتە نوێیەکە فشار بخەنە سەر دەوڵەتەکەی خۆیان و یارمەتی ئەوان بەکار دێنن بۆ چاکسازی و نەهێشتنی ستەم لە وڵاتەکانی خۆیان. هەروەها کارێکی تریان کۆکردنەوەی یارمەتییە بۆ مەبەستی خێرخوازی لە وڵاتی خۆیان، ئەو کەمینە کۆچکردووانە کە جێگیر بوون دەتوانن یارمەتی هەوڵەکانی چاکسازی بدەن لەوڵاتە ئەسڵیەکانیان و دەتوانن لەو وڵاتەی کۆچیان کردووە بۆی و بوون بە هاووڵاتی ئەویٚ کاریگەرییان هەبێت لە سەر سیاسەتی وڵاتە نوێیەکەیان لە ڕێگەی ئاشتییانەوە.

کۆچبەران — بنەما لەسەر ئەوەی کە دەبێت پارێزگاری لە یەکڕیزی کۆمەڵگەی ئیسلامیی بکەن — نابێت ببنە هۆکاری دروستبوونی توندوتیژیی ناو ئەو کۆمەڵگایەی لێوەی هاتوون و دەبێت خۆیانی لیٚ بپارێزن، ئەمە بە پێچەوانەی ئەو کۆچبەرانەی کە بۆ جیابوونەوەو بەرنگاریی کۆچیان کردووەو لە وڵاتی خۆیان نەیانتوانیوە درێژە بدەن بە خەباتیان لە کۆمەڵگەکەیاندا بە هۆی ستەم و ئازار و ئەشکەنجەوە، وە مەبەستیان لە کۆچ دروستکردنی بنەکەیەکی تر بۆ بەرەنگاربوونەوەی ستەمی وڵاتەکەیان بووە، ئەم حاڵەتە دەکرێت وەك ململانێی دوو دەوڵەتی سەربەخۆ هەژمار بکرێت، بەڵام لەم حاڵەتەشدا دەبێت ڕەچاوی بەرژەوەندیی ئوممەتی ئیسلامیی بە گشتیی بکرێت. کۆچکردنی موسڵمان لە هەموو حاڵەتەکاندا بە خۆبەدەستەوەدان و فەوتاندنی ماف و ئازادی دانانرێت، بەڵکو ئامرازێکە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ستەم و سەرخستنی چەوسێنراوان بە گوێرەی بارودۆخ.

ئەگەر کۆچکردن بۆ مەدینە وەربگرین وەك نموونەیەك کە وانەی لێ وەربگیرێت، دەتوانین بڵێین ئەو موسڵمانانەی کۆچیان کردووە بۆ هەر وڵاتێك لە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا، ئەو وڵاتانە بۆتە جێگرەوەی وڵاتەکانی خۆیان و دەتوانن بانگەواز بۆ ئیسلام لەو شوێنانەدا دەست پێ بکەن، دوور نییە خەڵکی ئەو وڵاتانە بە دەم بانگەوازی ئیسلامییەوە بێن و کەسی کۆچبەر ببێتە هۆکاری هیدایەت بۆ ئەو خەڵکە و وڵاتەکەش ببێتە شوێنێکی باشتر بۆ کەسی کۆچبەر وە خەڵکەکەش دەبنە برای و پشتیوانی. نمونەی ڕاکێشانی دڵی خەڵکانی ئەو وڵاتانەی کۆچی بۆ دەکرێت، بێ ڕەچاوکردنی ئامراز و مەبەست، جولەکەیە کە توانیوێتی پشتگیری هەردوو گەلی بەریتانی و ئەمریکی بۆ خۆی دەستەبەر بکات و کاریگەری هەبێت لە سەر بڕیاری سیاسیی زۆرێك لە سەرکردەکانیان بە هۆی پارەو یارمەتی هەڵمەتی هەڵبژاردەنەکانیان و سوود وەرگرتن لە و کاریگەرییە بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی جولەکە لە فەلەستین، ئەمەش ئامانجێکی تری دەبێت ئەویش خزمەتکردنی نیەتە گڵاوەکانی دەوڵەتانی ئیمپریالیزم و ڕق و کینەی هەندێك گرووپی ئایینییە.

گومانی تێدا نییە جیاوازیەکی زۆر گەورە هەیە لە نێوان کۆچی جولەکە و کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی، ئەمان بوون بە هۆی هیدایەت و ڕێنمونی، بەڵام جولەکە تەنها بووە هۆی ستەم وماڵوێرانی و داگیرکاریی خاك و وەدەرنانی خەڵکەکەی.

جۆرێکی تر لە ململانێ و ململانێی شارستانییەتەکانە لە نێوان گەلاندا و چەند شێوازێکی هەیە: هەیەتی ئیجابیە و هەیەتی سلبیە، هەیەتی بە شێوازی ئاشتییانە و گفتوگۆ و پەیوەندی، هەیەتی شێوازی سەربازی و توندوتیژیی وەردەگرێت.

ئەم شێوازی ململانێیە بریتیە لە کێبرکێی نێوان ئوممەتان بۆ پێشڕەوی و زاڵبوون و دەستکەوت، ئەوەی کە ململانێیەکە زیاد دەکات ئەو کەموکوڕیەیە کە دروست دەبێت لە پەیوەندی نێوان شارستانییەتەکان و شێوازی ژیانیان، کە وا دەکات لایەنی بەهێز بەرەو شوێنە بێهێزەکان بچن بۆ زاڵبوون بە سەریدا، ڕەنگە هەندێك جار ئەو کردارە بە شێوازی ئاشتییانە بکرێت، بەڵام هەندێك جار شێوازی سەربازی و شەڕ وەردەگرێت.

ململانێی ئاشتییانە ململانێیەکی شارستانییانەی بنیاتنەرە کە چاکسازی دێنێتە کایەوە، بەرەو پێشکەوتن و زانست دەچێت، ئەمەش ئەو واتایانەیە کە خوای گەورە لە سروشتی مرۆڤدا دروستی کردووە، گەلەکان لەم شێوازەی ململانێدا زیاتر دەگەن بە پێداویستی و بەها بەرزەکان و هاوسەنگی شارستانییانە.

بەڵام ململانێ سەربازییەکانی نێوان شارستانییەتەکان کە گەلەکان پێی هەڵدەستن، بریتییە لە قۆناغێکی پڕ لە دڵەڕاوکێ و ناجێگیریی و دروستبوونی ناهاوسەنگی، کە وا دەکات گەلان بە گشتیی و بە پەرۆشەوە بەردەوام لە گەڕاندا بن بۆ دۆزینەوەی خاڵی هاوبەشی هاوسەنگی نێوان شارستانییەتەکان، بەڵام بێگومان ئەگەر ئەو ململانێیە شێوازی ئاشتییانە بگرێتە خۆ، ئەوە بێگومان هاوسەنگی دادپەروەرانە و بەرەوپێشبردنی مرۆڤایەتی و پێکەوەژیانی لێدەکەوێتەوە، چونکە کۆمەڵگای ئاشتی و هاریکاری و خۆشگوزەرانی دەبێت بینا بکرێت لە سەر سۆز و هاوبەشی هەموو مرۆڤایەتی لەم ژیانەدا، لەسەر بنەماکانی دادگەری و هەستی بەرپرسیارێتی، هەر ئەمانەیە کە فەلسەفەی ئیسلامی لە سەر بنیات نراوە لە لایەنی پەیوەندی نێوان گەلان.

له ئێستادا باس له ململانێی شارستانی نێوان جیهانی ئیسلامیی و ڕۆژئاوا دەکرێت، وەك شتێکی نوێ باسی دەکرێت له مێژووی پەیوەندی نێوان هەردوولادا، بەڵام ڕاستییەکەی ئەم ململانێیه کۆنه و چەندەها سەدە پێش ئێستا دەستی پێ کردووە، هەر دوای پێشکەوتنی شارستانییەتی ئیسلامیی و زاڵبوونی به شێوازێکی تەوافوقی و بنیاتنەر که تێکەڵی دڵی گەلانی سەر زەوی بووبوو. ئەو ململانێیه له قۆناغەکانی کۆتاییدا زاڵبوونی هێزی ئیمپریالیستی به خۆیەوە بینی و ئاشکراترین نموونەی نەهامەتیەکانی گەلو خاکی فەلەستینە، هۆکاری ئەوەش بێهێزیی دەوڵەتی عوسمانی بوو، که بووە هۆی ئەوەی هێزی ڕۆژئاوا ململانێیەکی داگیرکاری و زاڵبوون له دژی جیهانی ئیسلامیی دەست پێ بکات، ئەو ململانێیه شێوازێکی سەربازیی سلبی درێژخایەنی تاڵی پڕ توندوتیژیی بوو به مەبەستی باڵادەستی ڕۆژئاواو بەرژەوەندییه ماددی و دەمارگیری و داگیرکارییەکانی، هەروەها شێوازی ژیانی ماددی و پووکاوەی بێباوەڕ بەسەر جیهانی ئیسلامییدا.

ئەو ململانێیه سلبییەی نێوان هەردوو شارستانییەتی ئیسلامیی و ڕۆژئاوا دەبێت لەو شێوازەوە بگۆڕێت بۆ شێوازێکی ئیجابی هەتا ئەو لایەنه سلبیانەی تێدا نەمێنێت، هەتا خاڵێکی هاوبەش و هاوسەنگی دروست بێت به هۆی کاریگەری لایەنه باشەکانی هەردوو شارستانییەت، هەربۆیه له بەرژەوەندیی مرۆڤایەتیدایه که ئەو ململانێیه بۆ شێوازی ئیجابی بنیاتنەر بگۆڕێت.

ئەو هێزه جوزئیه ماددەییەی ڕۆژئاوا هەیەتی پێویستی به ئەو هێزه گشتگیره ڕۆحییه عەقیدییه هەیه که له دیده گەردوونییه ئیسلامییەکەدا خۆی دەبێنێتەوە. لەم لایەنەوە دەبێت به گەشبینانه سەیری دواڕۆژی ئەم ململانێیه بکەین کاتێك دەرەنجامەکەی دەبێته کارلێکی ئیجابی نەك دووبەرەکی.

ململانێی ئاشتییانه و گفتوگۆی شارستانی و هەوڵی بەدەستهێنانی زانست و پێشکەوتن و ئاوەدانی کرۆکی شارستانیی ئیسلامیین، خوای گەورە دەفەرموێت: (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ) (البقرة: ٢٥٦).

(لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ * إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (الممتحنة: ٨ـ ٩).

(إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ) (النحل: ٩٠).

(قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) (آل عمران: ٦٤).

(وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ) (المائدة: ٢).

(اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) (العلق : ١ ).

(قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ * قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ) (الزمر: ٩ـ ١٠).

(قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ) (العنكبوت: ٢٠).

(وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مِّنْهُ) (الجاثية: ١٣).

(رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) (البقرة: ٢٠١).

(وَقُلِ اعْمَلُواْ فَسَيَرَى اللّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ) (التوبة: ١٠٥).

پەیماننامەی مەدینە و پەیمانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ گاورەکانی نەجران و مامەڵەی لەگەڵ سابیئە و ئەهلی کیتاب و ئاگرپەرستەکان، چەمکی (دار العهد) و (عهد الذمة) بۆ ئەوانەی لە ئاشتییان لە گەڵ موسڵماناندا، هیچ کەس زۆری لێ ناکرێت بە پێچەوانەی ویست و بیرەباوەڕی خۆی موسڵمان بێت یان کافر، وەسیەتەکانی خەلیفەکانی ڕاشیدین بۆ سوپاکانیان کە بە پاراستنی ژیانی ئەوانەی شەڕکەر نین. ئەمانە هەمووی نموونەی بەرزن بۆ ئەو ڕوئیا ئیسلامییە

شارستانییە لە ڕووی ئیجابی و خواستنی گفتوگۆ و پێکەوەژیانی ئاشتییانە هەر لە سەرەتای دروست بونیەوە، لە سەردەمی جیهانگیریشدا ئیسلام بەو وتارە شارستانییە ئاشتییانەی کە هەیەتی لەپێشترە بۆ بەڕێوەبردنی گفتوگۆی شارستانی ئاشتییانەی پێکەوەگونجان بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی.

ئاشتی و هاریکاری و خۆشگوزەرانی جیهانیی، سێ بنەمای سەرەکی هەیە کە ئیسلامیی لەسەر بنیات نراوە و ڕۆژئاوا و مرۆڤایەتی دەبێت دەرکی پێ بکەن و پەیڕەوی بکەن بە ڕاستی و ببنە هاوبەشی ئیسلام لەو بنەمایانەدا:

**یەکەمی** ئەو بنەمایانە هەستی مرۆڤەکان کە هەمووان بۆ یەك باوك و دایك دەگەڕێنەوەو هاوبەشن لەو شتەدا، ئەو جیاوازییەی هەیە لە نێوانیان بۆ ئەوەیە هاریکاری یەکتر بکەن و تەواوکاری یەکتر بن، جیاوازی لە ڕەنگدا بەڵگەیەکی خوای گەورەیە لە سەر داهێنان و باڵادەستی ئەو، نەوەك بۆ دەمارگیری و خۆ بەزلزانین، چونکە بەهای مرۆڤەکان وابەستەیە بە ناوەرۆك و خودی مرۆڤەکەوە نەوەك ڕەنگ و ڕەگەز و باب و باپیر.

**دووەمی** ئەو بنەمایانە دادگەرییە، ئەگەر چی لە زەرەری خۆت و خزمەکانت بێت یان لە قازانجی ڕکابەرەکەت بێت، چونکە ئاشتی و ئاسایش بەبێ دادگەری نایەتە دی، هەر بۆیە بنەمای دادگەریی یەکێکە لە گرنگترین ئەو بنەمایانەی فەلسەفەی ئیسلامی لە سەر بنیات نراوە.

**سێیەمی** ئەو بنەما گرنگانە هەستی بەرپرسیارێتییە، چونکە هەر کەس بێخەم بوو لە بەرپرسیارێتی سزا، ویژدانی بێهێز دەبێت، مەیلی ستەم و زیادەڕەوی و بێ ئەدەبی دەکات، بەڵام لە ئیسلامدا باوەڕبوون بە پەروەردگارو ڕۆژی دوایی و ئەنجامدانی عیبادەتەکان کە هەمووکات نزیکی دەکاتەوە لە خوای گەورە هاوتا لەگەڵ لایەنی پەروەردەو بنەما عەقیدەییەکان هەستی بەرپرسیارێتی لای موسڵمان دروست دەکات.

به بێ دروستکردنی گفتوگۆی شارستانییانەو ئاشتی جیهانی لە سەر ئەم بنەمایانە لەم گوندە جیهانییەدا، توانا ماددی تەکنەلۆجی و پێکدادانی گەلەکان دەبێتە هۆی زۆربوونی ستەم و توندیی ململانێ، بەڵکو بەرەو داهاتوویەکی پڕ ستەم و خوێناوی تر و مەترسیدار تر لە سەر داهاتووی مرۆڤ و شارستانییەت دەچێت.

دەبێت سنوورێك دابنرێت بۆ ململانێی سلبی و مەرامە داگیرکارییەکانی ڕۆژئاوا و کوڕە پەروەدەکراوەکەی (زایۆنیزم) لە دژی گەلانی جیهان، لە بەرمبەردا دەبێت گفتوگۆ و داننان بە توانا ماددی و مەعنەوییەکانی لایەنەکانی ململانێ بێتە کایەوە هەتا ئەو ململانێ سلبییە بگۆڕدرێت بۆ کارلێکردنی ئیجابی و هاوسەنگی شارستانی و هاریکاری لە سەر بنەمای بەرژەوەندیی دوولایەنە، چونکە بەردەوامبوونی ئەو ململانێیە بەو شێوازە سلبییە تەنها نەهامەتی و ستەم و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و دروستبوونی ئاستەنگ لە ڕێی هەوڵەکانی چاکسازی دروست دەکات.

ئیسلام زۆر سنوورو زەوابتی هەیە بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی ڕێکخستنی کۆمەڵگە مرۆییەکان، وەك هەموو سیستمە گەردوونییەکانی تر کە پێویستیان بە یاسا و ڕیسایە بۆ بەردەوامبوون، ئیسلامیش خاوەنی ئەو زەوابتانەیە کە هەندێکیان بۆ ماوەیەکی کورتن و هەندێکیان زەوابتی درێژخایەنن، ئەگەرنا ئەو نیزامە سەرەنجامی داڕووخانە.

ڕۆژئاوا ئەمڕۆ پێویستی بە ناسینەوە و سوودوەرگرتن هەیە لەو زەوابت و بنەما گشتییە ئیسلامییانەی کە هاوسەنگی و ناوەندگیری مرۆڤەکان دەپارێزن و سنووری ئازادی مرۆڤ وەك تاك یان وەك کۆمەڵگە دیاری دەکات و پارێزگاری لە دامەزراوەکانی سیستمی کۆمەڵایەتی دەکات. تەنها ئیسلام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا دەتوانێت – بە حوکمی ئەوەی ئایینێکی ئاسمانیی پارێزراوە، چونکە ڕۆژئاوا بەدیلی وەك ئەمی پێ نییە – هەموو ئەو زەوابت و یاسا و ڕیسایانە پێشکەشی

ڕۆژئاوا بکات کە هاوسەنگیی شارستانی و جێگیریی ڕۆحی و بەهای کۆمەڵایەتی دێنێتە کایەوە، ئەمانەش واتا مرۆیی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکانی ژیان بەرهەم دێنن و دووبارە ڕۆح و مادده پێکەوە گرێ دەداتەوە لەم جیهانەدا. هەربۆیە لە سەر ئەو لایەنانەی کە دەیانەوێت ئاگری فیتنە خۆش بکەن و ململانێی نێوان ئیسلام و ڕۆژئاوا بەرەو خراپتر بەرن، دەبێت واز لە کردەوەیان بێنن، چونکە ئەوە ململانێکە کۆتایی پێ ناهێنێت، هەروەها شارستانیی ئیسلامیی پێ لەناو ناچێت، چونکە شارستانیی ئیسلامیی بڵاوبۆتەوە بە هەموو سەرزەویدا وە بوونی هەیە لە هەموو شوێنێك کە پێویستە ڕۆحییەکانی مرۆڤ بوونی هەبێت، تەنها شتێك کە بەدەستی بێنێت زیادبوونی ناهاوسەنگی شارستانییەتی ڕۆژئاواو نەهامەتی جیهانی ئیسلامیی و ڕۆژئاوایە لە ڕێی ئاستەنگ دروستکردن لە بەردەم هەوڵەکانی گفتوگۆ و پێکەوە گونجان و سوود وەرگتن لە یەکتری لە لایەنە ئیجابیەکاندا. هەروەها نەهامەتی و ژیانتاڵی لە هەموو جیهاندا زیاد دەکات و هێنانەدی هاوسەنگی و پێکەوە ژیان دوورتر دەخاتەوە. لە سەر بیرمەندانی ئوممەتی ئیسلامیی پێویستە هەوڵی تەواو بدەن بۆ سوود وەرگرتن لە توانا زانستی و مادییەکانی ڕۆژئاوا بۆ ئەوەی جیهانی ئیسلامیی لە ڕووی مادییەوە جارێکی تر هاوسەنگی و کاریگەری خۆی بگێڕێتەوە. هەروەها دەبێت گفتوگۆیەکی بنیاتنەر دروست بکەن بۆ ڕاکێشانی ڕۆژئاوا لە ناوەوە، ئەویش بە گەیاندنی مەفهومە ڕۆحی و بەها بەرزەکان کە یارمەتی ڕۆژئاوا دەدات بۆ دروستبوونی هاوسەنگیی کۆمەڵایەتی و شارستانی، کە ئێستا وای لێ کردووە خەریکە دروستی لایەنی ڕۆحی و مرۆیی کۆمەڵایەتی لە دەست بدات، خەریکە بەو هۆیەوە بەڵایەکی گەورە بهێنێتە سەر خۆی و سەر هەموو مرۆڤایەتی بە هۆی ئەو فەوزا و فەسادی کۆمەڵایەتی و زاڵبوونی تاوانبارانەی داگیرکارییانە و کاولکاریی ماددی، بە شێوازێك بە خەیاڵی هیچ کەسدا نەهاتبێت و دەرەنجامەکەی تەنها خوای گەورە دەیزانێت.

له بەرامبەردا له سەر بیرمەندانی ڕۆژئاوایە – ئەگەرچی باڵادەستن– گفتوگۆ بخەنە شوێنی دەستدرێژیی ستەمکاریی، بیخەنە شوێنی هەوڵە بێئاکامەکانیان بۆ ڕووخاندنی شارستانییەتی ئیسلامیی، چونکە شارستانییەتی ئیسلامیی جیاواز له هەر شارستانییەتێکی تر و زیاتر له هەر شارستانییەتێکی تر بە هۆی توانا مرۆییەکانیەوە توانای مانەوەی هەیە. له سەریان پێویستە کە چاو بخێشێننەوە بە شێواز و سیاسەتەکانی خۆیاندا کە له هەقیقەتدا بەرژەوەندیی وڵاتەکانی خۆیشیانی تێدا نییە، وە گوێ نەگرن له هاتوهاواری داواکردنی شەڕ و دەستدرێژیی و کاولکاری کە له لایەن خەڵکانێکەوە دەردەچێت بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیانە و نیەتی پیس و ئامانجی خراپیان هەیە، دەبێت گوێ نەگرن له بانگەشەکەرانی دووبەرەکی نێوان شارستانییەتی ئیسلامیی و شارستانییەتی ڕۆژئاواو بێبەشکردنی هەردوولا لەو سوودانەی کە دەکرێت له کارلێکردن و هاریکاریدا هەبێت.

له کۆتاییدا گرنگە بیرمەندان دەرك بەوە بکەن کە گفتوگۆ، هاریکاری، کارلێکردن، پێکەوە گونجانی شارستانی ئیسلامی و ڕۆژئاوا و شارستانییەتەکانی تری مرۆڤایەتی، لەگەڵ گۆڕینەوەی ئەزمون و بەرژەوەندیی بۆ بەرزکردنەوەی ژیانی مرۆیی و دروستکردنی هاوسەنگی و پێکەوەژیان، ئامرازی هاریکاری نێوانیانە و کۆتایی هێنانە بە زوڵم و دووبەرەکی و ئاراستەکردنی ململانێکەیە بۆ دروستکردنی هاوسەنگی و فراونکردنی بواری سوودبەخشی هاوبەش. بێگومان ئەم گەردوونە بەو توانا زانستی و داهێنانەوە بە دادگەری و برایەتی جێگای پێداویستییەکانی هەموو مرۆڤایەتی تێدا دەبێتەوە.

بۆ دەرهێنانی ئوممەتی ئیسلامیی لەو کێشە فیکرییە شارستانییە شلۆقەدا کە پێوەی دەناڵێنێت، گرنگە تێگەشتنێکی مەنهەجی گشتگیری دروستمان هەبێت بۆ ئایەتەکانی قورئان و مەنهەجی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها شارەزایی پەیدا بکەین لە سروشت و واقیع و ڕێڕەوی ژیان و وانەکانی مێژوو کە ئوممەتی ئیسلامیی و ئوممەتانی چواردەوری پێیدا تێپەڕیون.

بۆ ئەوەی بزووتنەوەی چاکسازی بەرهەمی هەبێت، دەبێت بنیاتنانەوە دەست پێ بکات بە تەکنیکی ڕۆشنبیری ئیسلامیی و چاککردنی پرۆگرامەکانی پەروەردە و شوێنکەوتنی شێوازی زانستی لە دانانی بنەماکانی بە شێوەیەکی دروست، ئەو قۆناغەی کە لێکۆڵینەوەکانی زانستی دەروونناسی و کۆمەڵناسی گرنگییەکی گەورەی پێدەدەن بە تایبەتی لە ڕووی پرۆسەی پەروەردە و باوەڕی ئیجابیانە لەو قۆناغەدا کە بنەمای دەروونیی مرۆڤی تێدا دروست دەبێت. ئەمەیە بنەمای سەرەکی لە دوبارە دروستکردنەوەی تاکی موسڵمان، تاکێك کە یەکتا پەرست و ئازاد و هەڵمەتبەر و گەشبین و داهێنەر و خاوەنی ئەخلاق و فیکرێکی دروست بێت، خشتێکی سوودبەخش بێت لە بینای کۆمەڵگەی جێنشین و شورا بە ژیانێکی خۆش و سەربەرزییەوە.

ئەو مەنهەجە زانستیەیە کە تەنها چارەسەرە بۆ چاکسازی لە فیکری تاکی موسڵماندا، ئەو موسڵمانەی کە خەریکە ناسنامەی خۆی دەگێڕێتەوەو بە فیکرێکی دروستەوە کە بتوانن جارێکی تر تاکی موسڵمان و سیستمە کۆمەڵایەتییەکان دروست بکەنەوە، ئەو تێگەشتنە دروستە یارمەتی دەرە بۆ ئەوەی عەقڵییەتی شورا لە فیکری موسڵماندا جێگیر بێت و حیکمەت جێگای توندوتیژیی بگرێتەوەو هاریکاری جێگای دووبەرەکی، ئاشتی و ئاوەدانی و پێشکەوتن فەراهەم بێت لەم ئوممەتەدا.

تێگەشتنێکی دروستی ئەو کاتانەی کە توندوتیژیی تێدا بەکاردێت و پابەندبوون پێوەی، کرۆکی چارەسەری ئەو دووبەرەکییە تاڵەیە کە گەلانی

موسڵمان دەهاڕێت و توانا و هێزی دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن بە فیڕۆ دەدات، جا هۆکارەکەی هەرچی بێت.

گرنگە ئاماژە بە خاڵێك بدەین ئەویش ئەوەیە کە هەموو ئەو دووبەرەکییانەی وڵاتانی ئیسلامیی نێوان دەسەڵات و ئیۆزسیۆن لە کاتی ئێستادا ڕەنگدانەوەی ئەو زوڵم و ستەم و نەهامەتی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەیە لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە کە زۆرێك لە گەلانی موسڵمانی گرتۆتەوە.

هەروەها دەبێت ئەوە بزانین بانگەشەی ئیسلامەتیبوون و مۆرکی ئایینی کێشەیەك لە کێشەکان، زۆر جار تەنها بۆ بەکارهێنانی پاڵپشتێکی مەعنەوییە بۆ پرسەکەیان، بیانویەکە بۆ بەکارهێنانی توندوتیژیی کە فاکتەری سەرەکی زوڵم و ستەمەکەیە.

بەڵام ئاشتی نایەتەدی و چاکسازی دروست نابێت لە وڵاتانی ئیسلامییدا هەتا بنەمای بەکارنەهێنانی توندوتیژیی جێگیر نەبێت لە ویژدانی کۆمەڵگەی موسڵمان و دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆندا، ئەم بنەما زۆر ڕوون و ئاشکرا بێت وە بۆ خەڵکی وەکو خۆر بێت، بۆ ئەوەی شێوازی ئاشتییانە جێگای توندوتیژیی و شەڕ بگرێتەوە.

لەسەر دەسەڵاتدار پێویستە چارەسەری کێشەکان بکات و ستەم نەهێڵێت، لە سەر زانایان پێویستە بە باشی لەو بنەمایانە تێبگەن کە بەکارهێنانی توندوتیژیی هاریکاری نێوان خەڵکی ڕێکدەخات و هەوڵبدرێت بۆ ئەوەی ئوممەت جارێکی تر سەروەری خۆی بگێڕێتەوە لە ئیدارەکردنی خۆیدا.

لە بەرژەوەندی دەسەڵات نییە کە هۆکارەکانی دووبەرەکی و ململانێ پشتگوێ بخات، چونکە ئەم کارە تەنها دەسەڵات و دوژمنەکانی - ئۆپۆزسیۆن- بێهێز دەکات. لەلایەکی ترەوە بە کارهێنانی توندوتیژیی ڕێپێدراو لە دژی داگیرکەر و دەستدرێژیکەری بیانی ئامرازێکە کە لایەنی بێ دەسەڵات بەکاری دێنێت بۆ ئەوەی هەڕەشە دروست بکات لە سەر بەرژەوەندی ئابووری و سیاسیی ئەو وڵاتانەی

دەست وەردەدەن لە کاروباری ناوخۆی وڵات و هەوڵی ناجێگیری و تێکدانی ئاسایش و ڕێگری لە بەردەم پێشکەوتنیان دروست دەکەن.

بەرەنگاری گەلانی چەوساوە لە دژی ستەمکارانی بیانی وا دەکات بەرژەوەندی بیانی بکەوێتە مەترسیەوە و ئەو خێروبێرەی بۆی هاتوون وا بە ئاسانی دەستیان نەکەوێت و لە کاتی ئارامگرتن و بەردەوام بوون لە بەرەنگاربونەوەی بیانی لە کۆتاییدا وا دەکات لایەنی بیانی واز لە ستەمکارییەکەی بهێنێت و دەستی هاریکاری درێژ بکات، ئەمەش هەڵسوکەوتی دروستە – کە لە سەرتاوە دەبوو بیکات– وەك پەیوەندی نێوان شارستانییەتەکانی سەردەم، هەروەها گرنگە کە جیاوازی بکەین لە نێوان شەڕی جەبهەیی ڕەسمی و شەڕی پارتیزانی کە هەر یەك لەوانە سرشت و ئامرازو ئامانجی خۆی هەیە.

ئەو وتەیەش ڕاست نییە کە دەڵێت: شەڕە نیزامییەکان خەڵکی بێتاوان ناکوژن، بە پێچەوانەوە لە شەڕی نیزامیدا چەندجارەی شەڕی پارتیزانی دەکوژرێت، چونکە سەرکردە سەربازییەکان بیر لە ئامانجی سەربازی و مەدەنی ناکەنەوە، بەڵکو بیر لەو ئامانجە ستراتیژیانە دەکەنەوە کە زۆرترین ئامانج بە دەست دێنێت و کەمترین زیانی دەبێت. هەرچەندە سەرکردە سەربازییەکان بە هۆی ئەزمونیانەوە خۆیان لە ئامانجی مەدەنی دەپارێزن، بەڵام بە هۆی سروشتی چەکە نوێیەکانەوە ئەوە هەموو کات مومکین نییە، بە پێچەوانەوە لایەنی دژ بە سوپای نیزامی بە هۆی کەمی چەك و ئامراز و بێتوانایی لە ڕووبەڕووبوونەوەی سوپا و چەکە پێشکەتووەکانی زۆرجار ناچارە لە ئامانجی مەدەنی بدەن، کەوابوو خەڵکانی مەدەنی لە هەردوولا زەرەرمەندن.

کەوابوو گرنگە بنەماکانی ئیسلامیی پەیڕەو بکرێت و ببێتە بەرنامەکاری سەرکردە سەربازییەکانی بەرگری بۆ ئەوەی خۆیان لە کوشتن و کاولکاری و هەر شتێکی تر کە پێویست نییە بپارێزن و شەڕێکی عادلانە بێت لە هەموو کاتێکدا. وەك بینیمان شێوازی شەڕی بەرگری بە جۆرێکە کە دوژمنی بیانی بێهێز دەکات و

تواناكانى پىٚ سەرف دەكات و ترس و ناسەقامگيرى بۆ دروست دەكات، ئەمەش واى لىٚ دەكات كە بە حيساباتى خۆيدا بچێتەوە. نموونەى جەنگى بەرگرى مقاوەمەى فەرەنسا و ڕووسيا دژى ئەڵمانەكان و مقاوەمەى جەزائيرى دژى فەرەنسا و ڤێتنام دژى ئەمريكا و ئيرلەندييە كاسۆليكەكان دژى زۆرينەى پرۆتستانت، هەروەها چەندانى تر لە ئاسيا و ئەفريقا و ئەمريكاى لاتين.

خۆ گێلكردن لە ستەم و پشتگوێخستنى لەگەڵ كۆنترۆڵنەكردنى نەفس واى كردووە بەردەوام توندتيژيى زۆر بێت و قوربانى مەدەنيشى زۆر بێت، بەڵام زوڵم و ستەم هەرچەندە درێژخايەن بن، تەنها دادگەرى بنەماى ئاسايش و ئاشتييە.

سەرەنجام ئەو ڕاستييە وەك خۆى دەمێنێت كە شەڕ و نەهامەتى دژى برايەتى مرۆڤەكانە و بێگومان لە بەرژەوەندى هەموو لايەكە كە توندوتيژيى لە پەيوەندييەكانياندا نەمێنێت. ئەو لايەنە ئيسلامييانەش كە بانگەشە بۆ چاكسازى دەكەن دەبێت شێوازى ئاشتييانە بگرنەبەر و ئارامبگرن لە دژى ستەمى دەسەڵات، چونكە وانەكانى مێژوو هەروەها سروشتى مرۆيى لە ناخماندا پێمان دەڵێت ئەوە شێوازە ڕاستەكەيە و لە كۆتاييدا بنەماكانى ئاسايش و دادگەرى و هاريكارى و پێشكەوتن و سەقامگيرى و شورا لە كۆمەڵگەدا جێگير دەبێت.

بەڵام بانگخوازانى ململانێى و دووبەرەكى نێوان شارستانييەتەكان دەبێت بە ئاگا بێنەوە و واز لە گرتنى ڕێگاى ستەم و كاولكارى بێنن، چونكە لە تواناى مرۆڤايەتيدا نەماوە كە چيتر زنجيرەى خوێناوى تەماشا بكات و باجەكەى بدات، لە سەر خەڵكانى عاقڵ پێويستە بەرەنگارى ئەو بانگەشە تێكدەرانە ببنەوە و ئەو مەترسيانەى كە هەڕەشە لە داهاتووى مرۆڤايەتى و شارستانييەت دەكەن، ڕێگرى لىٚ بكەن.

### ئەگەرى مەترسى:

جوڵەو چالاكى كۆمەڵگە بە گشتيى سروشتێكى بازنەيى هەيە كە لە نێوان دوو جەمسەرى دژ بە يەك دێت و دەچێت لە ژێر كاريگەرى ئەو هۆكارانەى كۆدەبنەوەو

کار دەکەنە سەر ئەو جوڵەی کۆمەڵایەتییە بەرەو یەکێك لەو جەمسەرانە، ئیتر بەرەو ئاشتی و سەقامگیری و ئاوەدانی بێت یان بەرەو توندوتیژیی و دووبەرەکی و پەرتەوازەیی بێت. کەوابوو گرنگە کە سەرکردەو ڕێبەرانی فیکری و سیاسەتمەدارنی ئوممەت لەو هاوکێشەیە تێبگەن و ئەو هۆکارانە بناسنەوە کە جوڵەی کۆمەڵایەتی بەرەو لایەنی باش دەبات و هەوڵی ڕێگری بدەن لەو هۆکارانەی کە بەرەو لایەنی خراپی دەبەن.

یەکێکی تر لە و مەترسیانە ئەوەیە کە پرۆسەی پەروەردەو پێگەیاندن تەنها وەك شتانێکی هەیکەلی و ئیداری سەیر بکرێت و بە بنەمای فیکری بیروباوەڕ کە لە ویژدان و دەروونی خەڵکیدا جێگیر دەبێت لە قەڵەم نەدرێت. ڕۆڵی بیرمەندان و ڕۆشنبیران و ئەوانەی پرۆسەی پەروەردە بەڕێوە دەبەن و دایکان و باوکان و سەرکردە و سیاسەتمەداران چەند ڕۆڵێکی تەواوکەریان هەیە لە چەسپاندنی بۆچوون و بیروباوەڕ و ئاڕاستەی فیکری و بەهاو ڕەوشت و هەڵسوکەوت کە نەوەکانی لە سەر دروست دەبن هەر لە منداڵییەوە، چونکە چۆن پەروەردە بوبێتن بەو شێوە مامەڵە دەکەن و هەموو بەرچاوڕوونییان پشت دەبەستێت بە پەرەوەردەی منداڵییان و ئەو قۆناغانەی دواتری ژیانیان لە دروستبوونی کەسایەتییاندا.

کەوابوو ئەوەی پێویستە لە سەر ئەو کەسانەی باسمان کرد، ئەوەیە کە هەوڵەکانیان یەك بخەن و مەنهەجێکی تەواوی تێروتەسەل دانێن بۆ پەروەردەی نەوەکان، بە شێوازێك کە لایەنە گرنگە پشتگوێخراوەکان لە خۆ بگرێت، بە لایەنی پەروەردەی سیاسیی کە بنەماکانی لە سەر ڕێنماییەکانی ئیسلام داڕێژرابێت و واتاکانی دادپەروەری و برایەتی و شورا و خۆشمامەڵەیی لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا دامەزراوە، ئەمانەیە بنەمای پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی و هێمنی و ئاسایش و سەقامگیرین و دەبێت بنەماکانی دروستکردنەوەی ئوممەت و جوڵەی بەرەو داهێنان و ئاوەدانی لە سەر دابمەزرێت.

هەتا ئەو کاتەی هەوڵەکانی پەروەردە بەروبومی دێتە کایەوە و کاریگەری دەبێت لە بنیاتی کەسایەتی تاکی موسڵمان و لە کۆمەڵگەدا، ئەو کەسایەتییەی کە مەنهەجیەت و زانستیانە مامەڵە دەکات و توانای ڕۆشنبیری و داهێنان و مامەڵەی دروستی هەیە، دەبێت ئێمە لە دیاردەی دروستبوونی کێشەی توندوتیژیی سیاسیی کە لە وڵاتانی ئیسلامییدا بوونی هەیە سەقامگیری نەهێشتووە، تێبگەین.

لە کاتێکدا خەڵکی بە گشتیی ئاگاداری چەمکی ئیسلامیی نین سەبارەت بە مەنهەجێکی دروست بۆ گۆڕان و چاکسازی بە شێوازی ئاشتییانە و پابەند بوون پێوەی لە ڕووی فیکری و ویژدانەوە، فەرمانڕەواکانی جیهانی ئیسلامیی زۆر بە ڕواڵەتی و سادەیی مامەڵە لەگەڵ کێشە گەورەکاندا دەکەن و بەبێ لێکۆڵینەوەو تێگەشتنی دیاردەکە، تەنها ئامانجی خۆیان ئەوەیە کە بەپرسیارێتی لەسەر شانی خۆیان لابەرن و زەحمەتی گۆڕان و سەرکۆنە کردن لە ئەستۆ نەگرن و ئەو بەرپرسیارێتیە بخەنە ئەستۆی لایەنێکی تر.

لە هەموو وڵاتانی ئیسلامییدا زۆرێك لە گەنجان دەناڵێنن بە دەست هەژرای و پشتگوێخستن و کەمدەرامەتی و نەبوونی خزمەتگوزارییەکانی پەروەردەو بڵاوبوونەوەی بێکارییەوە، لە بەرامبەردا کۆمەڵێکی کەمی تر ماڵ و سەروەتێکی بێئەندازەیان هەیە و بە بێ ئامانج ماڵەکەیان خەرج دەکەن و بە فیڕۆی دەدەن.

لەم حاڵەتەدا شتێکی نامۆ نییە کە کۆمەڵێك لەو گەنجانە تووشی بێهیوایی ببن و دڵیان پڕ بێت لە ڕق و کینە و بتەقنەوە بە ڕووی کۆمەڵگە و دەسەڵاتدا.

لەم کاتەشدا ئەم کۆمەڵە ڕق لە دڵە پەنا دەبەنە بەر هەر ئامرازێکی ماددی و مەعنەوی بۆ بەکارهێنانی لە بەرژەوەندی ئەو قەناعەتەی خۆیان و دەیخەنە خزمەتی تۆڵەو هەڵگەڕانەوەو نیشتمانپەروەری، بنەماکانی ئیسلام بەکار دەهێنن بۆ ئەو مەبەستەیان. لێرەشدا ئەو هەڵەیەی کە زۆرێك لە دەسەڵاتداران تێیدەکەون بە سادەیی و ڕواڵەتی مامەڵەکردنە لە گەڵ ئەو کێشەیەدا و هۆکارە ڕاستەقینەییەکان پیشتگوێ دەخەن لە هەژاری و نەزانی و دەردەسەری و ئیهانەکردن، پەنا دەبەنە بەر توندوتیژیی و هێز بۆ ڕیشەکێشکردن و دامرکاندنەوەی ئەو هەڵگەڕاوانە، هۆکارەکەش ئەوەیە کە گۆڕان و چاکسازی کردن لە حکومەتدا شتێکی ئاسان نییە، بەڵکو

بەکارهێنانی توندوتیژیی و هێز ئاسانترە بۆ دەسەڵات بە تایبەتی کاتێك خەڵکانی نەفس نزم و شەڕخواز چواردەوری دەسەڵاتیان داوە.

چارەسەری دروست ئەوەیە کە دەسەڵات لەو وڵاتانەدا بە حەکیمانە مامەڵە بکات و کۆنترۆڵی خۆی بکات و سنوورێك دانێت بۆ ئەو ئیجرائاتانەی دەیکات بەرامبەر بەو کۆمەڵ و تاکانە، توندوتیژیی و سزا تەنها کەسانی تاوانبار بگرێتەوە، چونکە فراوانکردنی بازنەی سزا بۆ کۆمەڵێکی زۆر بە بیانووی هاوفیکری و ئەندامی ڕێکخستن بە بێ ئەوەی هیچ تاوانێکی لە سەر بچەسپێت، تەنها بازنەی توندوتیژی، فراوان دەکات و ڕق و کینە زیاتر دەکات و دەبێتە هۆی بە فیڕۆدانی زۆر توانا و نەمانی هەستکردن بە ئاسایش و سەقامگیری و وا دەکات ئەو تاکانە بواری گەڕانەوەیان نەبێت سوود لە هەڵەکانیان وەرنەگرن و دەرەنجامیش ئوممەت بە گشتیی دەبێت نرخێکی گەورەی ئەو هەڵانە بدات. وانە و ئەزمونی مێژوویی لەم بارەوە زۆرن، جا ئەو دەرەنجامە خراپانە زۆرتر دەبن کاتێك کە توندوتیژیی و بەکارهێنانی هێز وەك ناسنامەی لێ دەکرێت و تەنها ئینتیما بۆ ئوممەت و ئیسلامەتی بە تاوان دابنرێت و هەموو هەوڵێکی گۆڕان چاکسازی بە چاوی گوماناویەوە سەیر بکرێت و بە تاوان دابنرێت، لەم حاڵەتەشدا دووبەرەکی و شەڕ و کوشتار پشێوی و زوڵم و ستەم و سەرکوتکردن بەردەوام دەبێت.

هەربۆیە دەبێت دەسەڵاتداران زۆر بە وردی و بە جیددی مامەڵەیەکی دروست لەگەڵ ئەم کێشەیە بکەن، بۆ ئەوەی بە شێوازێکی گونجاو کە دەرەنجامێکی باش دەبێت زاڵبن بە سەر کارە توندوتیژییەکاندا و چارەسەری بکەن و جوڵەی کۆمەڵگە بە شێوازێك ئاراستە بکەن، کە بەرەو جەمسەری ئاشتی و سەقامگیری و چاکسازی ڕێ بکات، بۆ بەدەستهێنانی ئەم مەبەستەش چەند خاڵێك هەیە سەرکردەکان دەبێت ڕەچاوی بکەن:

یەکەم: پابەندبوونی سەرکردەو ڕێبەرانی سیاسیی و فیکری عەقیدی بە بنەمای بەکارنەهێنانی توندوتیژیی لە چارەسەری کێشەی سیاسییدا و ئیدانە و مەحکومی بەکارهێنانی بکەن بەبێ ئەملا و لا و مراوەغە، جێگیر بوونی بنەمایەکە ئەوە

دەخوازێت کە بەکارهێنانی توندتیژیی لە هیچ کاتێکدا شتێکی ڕێپێدراو و مەشروع نییە بۆ هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگە بەبێ جیاوازی.

**دووەم:** دەسەڵات لە پێش خەڵکانی ترەوە دەبێت کۆنترۆڵی خۆی بکات و زیادەڕەوی نەکات لە بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژیی بە توندوتیژیی، واز لە بەرپرسیارکردنی خەڵکی بهێنێت تەنها بە هۆی ئینتیما و بۆچوونی فیکرییەوە، تەنها ئەو کەسانە سزا بدات کە بە بەڵگەی یاسایی تاوان دەچەسپێت لە سەریان و هیچ کەسێك بە هۆی تاوانی کەسێکی ترەوە سزا نەدرێت،(ولا تزر وازرة وزر أخرى).

**سێیەم:** دەبێت بە پلان و کارکردنی بەردەوامی جیددی کار بۆ نەهێشتنی هۆکارەکانی مەینەتی و گلەیی و تورەیی و هەڵگەڕانەوە لە کۆمەڵگەدا بکرێت، هەروەها کار بۆ پاراستنی کەرامەتی خەڵکی و دابینکردنی هەلی کار و سەرچاوەی ژیانی سەربەرزانە لە ئاستێکی مامناوەندی و بۆ هەموو تاکەکانی ئوممەت بکرێت، دەبێت پێویستییە بنەڕەتییەکان بۆ هەموو هاووڵاتیان دابین بکرێت.

**چوارەم:** گرنگیەکی باش بدرێت بە پرۆسەی فێرکردن و ڕاهێنان و بوجەیەکی باشی بۆ دابین بکرێت لە لایەن دەسەڵاتەوە، چونکە لە کۆتاییدا تەنها زانست و زانیاری توانای تاکەکان بۆ داهێنان و بەرهەمهێنان و ئەدای باش کاریگەری هەیە لە پێشبڕکێی شارستانییەتەکاندا.

ئەمانە چەند هەنگاوێکی کردەیی بوون کە دەسەڵاتداران دەتوانن پەیڕەوی بکەن وەك سەرەتای چاکسازی دەستی پێ بکەن بۆ ئەوەی بازنەی چاکسازی فراوانتر بێت و بازنەی تونوتیژیی و دووبەرەکی تەسکتر بێتەوە، هەروەها پێشەکییەك بێت بۆ ئەوەی نەوەکانی داهاتوو بە پەروەردەیەکی دروست پەروەردە بکرێن و شارستانییەتی ئیسلامیی زیندوو بکەنەوە لە سەر بنەمای یەکتاپەرستی و جێنشینی و ڕەچاوکردنی ئەخلاق و ڕەوشت لە ئەنجامدانی کاردا.

ئوممەتی ئیسلامیی و وڵاتانی ئیسلامیی لە سەدەی ڕابردوودا بە هۆی دووبەرەکی و بێهێزییەوە بووبوونە ئامانجی ئەم و ئەو و تەماح کرابووە سەرچاوە و بازاڕەکانی، ئەو بێهێزی و دووبەرەکییە تەنها هۆکار نەبوو، بەڵکو ڕق و کینەی مێژوویی کاریگەری هەبوو لە داگیرکاری و دەستدرێژی لە دژی، پیلان و شەڕ و داگیرکاری وڵاتانی ئیسلامیی کردە فەقیرترین ناوچە و پڕ لە نەهامەتی و زۆرترین پشکی هەبێت لە هاووڵاتیانی دەربەدەر و پەنابەر و چەندەها وڵاتیشی داگیرکراوە.

بێگومان لە کاتی داگیرکاریدا گەلان بە گشتیی دژی دەسەڵاتی داگیرکەر دەوەستنەوەو هەوڵی نەهێشتنی ستەم و دەستدرێژی و داگیرکاریەکە دەدەن. هەرچەندە بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەران تایبەت نییە تەنها بە گەلانی مسوڵمانەوە، بەڵام هێزە داگیرکەرەکان، کە هەموو ئامرازەکانی ڕاگەیاندنیان لە بەردەستە و باڵادەستن لە ڕاگەیاندندا، ناشیرینکردن و شێواندنی وێنای موجاهید و بەرگریکارانی موسڵمانی کردۆتە پیشە و بە تەنها ئەم کارەشی دژی ئەمانە، جیهاد و هەوڵ و تێکۆشانیان بە تیرۆر و توندوتیژیی ناودەبات، ئەم ناوبردنی جیهاد و بەرگریەی موسڵمانان تایبەت نییە بە وڵاتێکەوە، بەڵکو لە هەر شوێنێك بن بەو شێوازە ناودەبرێن و تۆمەتبار دەکرێن، ئەمەش دیارە هۆکاری مێژوویی دەمارگیری ئایینی وڵاتانی ڕۆژئاوا هۆکاری سەرەکییە لەم کارەدا، بەدەر لەوەی کە بە تیرۆریست ناوی بەرگرییکاران و موجاهیدان دەبات، ئەو تیرۆر و توندوتیژییە پاڵ دەداتە ئایینەکەیان و نایداتە پاڵ کەسەکان، ئایینی ئیسلام و عەقیدەی موسڵمانی پێنج یەکی جیهان دەکاتە پاڵنەری ئەو کارانەی کە بە تیرۆری ناو دەبات، چونکە سەربەستی ڕەوا نابینێت بۆ گەلانی موسڵمان و هاریکاری نێوان گەلێکی موسڵمان بۆ گەلێکی داگیرکراوی مسوڵمان بە هەمان شێوە جۆرێکە لە تیرۆر، ئەمەش بۆ ئەوەی داگیرکاری و هێنانەدی مەرامەکانی خۆیان ئاسانتر بێت و گەلانی موسڵمانیش لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە بڕووخێنن.

هەرچەندە بزووتنەوە تیرۆریستەکانی هەرێمی باسکی ئیسپانیا، ئێرلەندای باکوور لە بەریتانیا و چەندەهای تر لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و ئەمریکای باشوور لەپێشترن بۆ ئەوەی بە تیرۆریست ناوببرێن، بەڵکو تیرۆر لە هەندێ لەم وڵاتانەدا مێژوویەکی کۆنی هەیە لە کوشتنی خەڵکانی مەدەنی بێتاوان و پاکتاوکردنی کەمینە موسڵمانەکان، وەك مسوڵمانانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا، بەڵام کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا زۆر بە سادەیی و سەرزارەکی باس لەو ڕووداوانە دەکەن و دەیدەنە پاڵ ڕێکخراوێکی دیاریکراو بە تەنها، هیچ پەیوەندییەکی نییە بەو ئوممەت و شارستانییەتەوە کە ئەوان ئینتیمایان هەیە بۆی، کەوابوو تیرۆری ئەو ڕێکخراوە ڕۆژئاواییانە تیرۆری ڕۆژئاوایی، ئەوروپی، مەسیحی، کاسۆلیکی، ئیسپانی، ئێرلەندی نین و تەنها پەیوەستن بەو تاك و ڕێکخراوانەی ئەنجامی دەدەن، هەندێك جار ئەو کردەوە تیرۆریستییانە کرداری ڕێکخراوی (ئیتا)ن و هەندێك جاری تر (ئای، ئاڕ، ئەی)[٢١] لێی بەرپرسیارەو ئوممەت و ئایین و شارستانییەتەکەیان بەرییە لەو کارانە، بە پێچەوانەی ئیسلامەوە کە بە هۆکاری تیرۆر لە قەڵەم دەدرێت.

ناشیرینکردن و شێواندنی وێنای سەربازانی بەرگریکاری موسڵمان کە لە دژی هێزە داگیرکەرەکان دەجەنگن و ناونانیان بە تیرۆریست و پاڵدانی ئەوەش بە ئیسلامەوە، تەنها مەرامی گڵاوی هێزە داگیرکەرەکان ئاشکرا دەکات کە دەیانەوێت وڵاتانی تر داگیر بکەن و ڕۆشنبیریی و شارستانییەت لە میللەتانی تر دامالَن. جا بەرەنگاربوونەوەی ئەو مەرام و ویستە دڕندانەیەی شارستانییەتی ڕۆژئاوا و هێزە داگیرکەرەکان دەبێت یەکێك بێت لە ئامانجە گەورەکان بۆ دابینکردنی داهاتووی ئاشتی شارستانییەتی مرۆڤایەتی و ڕزگارکردنی مرۆڤ لەو

---

[٢١] (Irish Republic Army) ڕێکخراوێکی ئێرلەندی کاسۆلیکییە کە توندوتیژیی دژی پرۆتستانتە ئێرلەندییەکان ئەنجام دەدەن و کورتکراوەی (IRA)ە.

ویست و حەزە داگیرکاری و دەمارگیریانە کە هەر لە کۆنەوە هۆکاری چەندەها کێشەی مرۆڤایەتین.

ئەو ڕاستییەی کە نابێت لە بەرچاومان ون بێت ئەوەیە کە تیرۆر، ناوێکی پڕاوپڕە بۆ ئەو کارانەی کە هاووڵاتی دژی هاووڵاتییەکی تر دەیکات بۆ بەدەستهێنانی ئامانج و مەرامە سیاسییەکانیان، ئەمەش ڕێك ئەو کارانە دەگرێتەوە کە ئەنجام دەدرێت لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەوروپا و لە ئەمریکا، بەڵام ئەو توندوتیژییەی کە گەلانی داگیرکراو ئەنجامی دەدەن دژی داگیرکەران و ستەمکاران ئەوە بۆ بەرگری کردنە و تەنها وەسیلەی ڕێپێدراوە لە بەردەم گەلانی ستەملێکراودا بۆ نەهێشتنی ئەو ستەم و داگیرکارییە.

لەسەر لایەنگرانی ئازادی و سەربەستی و خەڵکانی خاوەن ویژدانی زیندوو پێویستە کردەوەی تیرۆریستی دژ بە تاکەکان بۆ بەدیهێنانی ئامانجی سیاسیی و تێکدانی باری ئاسایش و سەقامگیری وڵات تێکەڵ نەکەن لەگەڵ مافی گەلانی ستەملێکراو داگیرکراو لە بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەران و نەهێشتنی ستەم و تاڵانکردنی خێر و بێری وڵات.

ئەم جیاکردنەوەی نێوان تیرۆر و بەرەنگاربوونەوەی شەرعی و جیهاد لە دژی ستەمکار دەبێت شتێکی ڕوون و ئاشکرا بێت لە سیاسەتی ئەو وڵاتانەی ئاشتییان دەوێت و لای دەسەڵاتدارانی وڵاتانی ئیسلامیی و دەزگاکانی ڕاگەیاندن و هەموو ئەو هێزانەی گرنگی بە داهاتووی ئاشتی جیهانی دەدەن، نابێت شوێنی پیلانی ڕاگەیاندنی داگیرکەران بکەون لە دژی ئوممەت و پرسە ڕەواکان و ئاشتی جیهانی.

دەبێت بۆ ئوممەتی ئیسلامیی بە حکومەت و خەڵکەوە، شتێکی ڕوون و ئاشکرا بێت لە فیکری زانا و ڕۆشنبیر و سەرکردەکانیدا، ئەو جیاوازییەی کە هەیە لە نێوان جەنگان دژی داگیرکەر و ستەمکار و لە نێوان تۆقاندن و تیرۆر لە دژی هاونیشتمانی خۆیان و ئەوانەی پەیوەندی سۆزو بەزەیی کۆیاندەکاتەوە، چونکە بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەری بیانی بە هەموو شێوازێك کە بارودۆخ پێویستی

دەکات شتێکی ڕەوایە و لە سەر گەلانی چەوساوە واجبە هەموو ئامرازێکی بەردەست بۆ وەدەستهێنانی ئامانجی ڕەوای خۆیان و لێدانی ئامانجە ستراتیژییەکانی دوژمن بەکاربێنن وەك چۆن لە جەنگی نێوان سوپاکان و لە جەنگی ڕزگاریخوازیدا ڕوودەدات، ئەگەر سەیری ڕووداوەکانی مێژوو بکەین، دەبینین ڕووداوەکانی هێرۆشیما و ناکازاکی و لەندەن و هامبۆرگ لە جەنگی دووەمی جیهانی و شەڕەکانی ڤێتنام و ئەفغانستان و ڕووسیا لەم شێوانە بوون، بەڵام وەك بەرپرسیارێتییەکی ئیسلامیی دەبێت بەکارهێنانی هێز بە پێی پێویست بێت، هەرچەندە وەك ئاشکرایە لە سەردەمی تەکنەلۆجیای سەربازیی پێشکەتووی ئەمڕۆدا موجاهید و جەنگاوەرانی سەربەستی ناتوانن لە شەڕی جەبهەییدا ڕووبەڕووی سوپای داگیرکەر ببنەوە، ئەگەرنا شکست دێنن و لەم حاڵەتەشدا تەنها چارەی ڕزگاریخوازان پەنابردنە بەر شەڕی پارتیزانی و عەصاباتە، کە دەکرێت هەموو ئامانجێکی ستراتیژی بکەنە ئامانج بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی سەربازییە یان مەدەنی، ئەوەش مەبەست لێی تۆقاندنی گەلانی لایەنی ستەمکارە بۆ ئەوەی فشار بخەنە سەر ستەمکار بۆ کۆتاهێنانی دەستدرێژییەکەی.

وەك دەزانین سەربازانی دوژمن ئامانجی کردەوەکانی ڕزگاریخوازانن، بەڵام زەرەردانی زۆر لە کۆمەڵە سەربازێك یان سوپایەکی پڕ چەکی نوێ ئاسان نییە و کوژراوی دوژمن لەو جۆرە شەڕانەدا سنووردارە، لە کۆتاییدا مەبەست کوشتنی کەسانێك نییە بە تەنها یان هەتا شکستی سوپایەکی نیزامی، بەڵکو ئامانجی سەرەکی ڕزگاری گەلە، ئەویش بە تۆقاندنی دوژمن و ترس خستنە نێو سەرباز و جەماوەر و دامەزراوەکانی و بێتواناکردنی لە بەردەوامبوونی لە شەڕ لەڕووی ئابووری و پشتگیریی گەلەوە، ئەمەیە ئامانجی سەرەکی سەربازانی ڕزگاری و هەموو کردەوەیەك بیانگەیەنێتە ئەم ئەنجامە و کاری ڕزگاریخوازان ئاسانتر بکات و دوژمن ناچار بکات بە حیساباتی خۆیدا بچێتەوەو وای لێ بکات دەست لە

دوژمنكارييەكەی خۆی هەڵگرێت، ئەوە ڕێگایەكی مەشروعە بۆ سەربازانی ڕزگاریخواز، جا ئەو ئامانجە مەدەنی بێت یان سەربازی.

ئەمەیە سروشتی شەڕكردن بۆ ڕزگاری و سەربەستی و ئەو وانانەیە كە مێژووی دوور و نزیك فێرمان دەكات و لە ئەزموونی گەلاندا ڕوویدا، لە شەڕكردن دژی داگیركەر لە هیند و صین و ئەمریكای لاتینی و جەزائیر و ئەفغانستان، دەبێت ئەوە بیری سەركردەكانی ئوممەتی ئیسلامیی بخەینەوە كە واجبە گەلانی داگیركراو بجەنگن بۆ ڕزگاری و سەرفرازی خۆیان، بەڵام لە هەمان كاتدا ئەوە بیری موجاهیدان دەخەینەوە كە هەموو كات موسڵمان دەبێت هەست بە بەرپرسیارێتی بكات و شەڕكردن و بەكارهێنانی توندوتیژیی تەنها بەپێی پێویستە و دواهەمین چارەسەرەو خۆی لە خۆیدا ئامانج نییە، بەڵكو وەسیلەیە بۆ گەشتن بە ئامانج، لە سەر هەموو گەلانی موسڵمان و گەلانی جیهان پێویستە یارمەتی چەوساوەكان بدەن بە پێی توانا.

لە كۆتاییدا گرنگە ئەوە بیری هەمووان بخەینەوە كە كۆتایی هێنان بەو شەڕ و كوشتار و نەهامەتییە تەنها بە مامەڵەی دروست دەبێت لەگەڵ هۆكاری سەرەكی پرسەكەدا، ئەویش بە كۆتایی هێنان بە دەستدرێژی و زوڵم و ستەم لە گەلان و كۆتایی هێنان بە مەینەتی گەلانی چەوساوە لە سەر بنەمای دادگەری، مافی خۆیان پێ بدرێت هەتا هۆكار نەمێنێت و سوتەمەنی لە ئاگرەكە ببڕێت و پاڵپشتی جەماوەریی بۆ ئەو كارانە نەمێنێت، چونكە لەم گوندە جیهانییەدا كەس بێزەرەر دەرناچێت لە دەرەنجامی ئەو شەڕ و توندوتیژییەی بە هۆی زوڵم و ستەمەوە دروستبووە، ناكرێت مرۆڤایەتی بێدەنگ بن لە ئاستی داگیركاری و زوڵم و ستەم و لێی گەڕێن ڕووداوەكان بە پێی یاسای دارستان (شريعة الغابة) بچێت بە ڕێوە، چونكە نە مرۆڤایەتی دارستانە و نە مرۆڤەكان ئاژەڵن تێیدا، دەبێت سەركردە سیاسییەكان دەرك بەو قۆناغە فیكرییە شارستانییەی مرۆڤایەتی پێگەشتووە بكەن و لە بری ئاگر و ئاسن بە زمانی دادپەروەری و سیاسەت و ئینسافەوە لە گەڵیان بدوێن.

به نیسبەت کەمینەی موسڵمان لەو وڵاتانەی کە زۆرینە ناموسڵمانن دەبن بە دوو بەشەوە: هەندێکیان لەو وڵاتانەدان کە وڵاتەکەیان لایەنێکی ستەمکار نییە لە دژی موسڵمان و گەلانی تر، هەندێکیان بە پێچەوانەوە، وڵاتەکانیان ستەمکارن بەرامبەر موسڵمان یان گەلانی تر، لە هەردوو حاڵەتەکەدا موسڵمان لەو وڵاتانەدا لایەنێکی سیاسیین و کاریگەرییان هەیە لە بڕیاڕی ئەو وڵاتانەدا بە ڕاستەخۆ یان ناڕاستەخۆ، دەبێت هەوڵی ئەوە بدەن کە بە ڕێگای ئاشتییانە یارمەتی موسڵمانان و غەیری موسڵمانی چەوساوە بدەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کەمینە موسڵمانەکان بە ڕێگای سیاسیی و بێ توندوتیژیی یارمەتی وڵاتەکەی بدات بۆ گرتنەبەری سیاسەتی دادپەروەرانە و دروست بەرامبەر بە موسڵمان و غەیرە موسڵمان، لەو کارەیشیدا دەبێت ئارامگر بێت و کۆڵنەدەر بێت، بۆ هاتنەکایەی دادپەروەری بۆ هەمووان کە بنەمایەکی ئیسلامییە و سازشی لە سەر ناکرێت و نابێت بە هۆی قەناعەتی تاکەکانیەوە بەشدار بێت لە هیچ سیاسەتێکی هەڵە لە دژی موسڵمان یان غەیرە موسڵمان، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ) (المائدة: ٢) واتا: هاریکاری یەکتر بن لە چاکەدا و هاریکاری یەکتر مەکەن لە خراپەدا و لە خودا بترسن. بۆ کەمینە موسڵمانەکان یان هەر لایەنێکی تر نییە کە پەنا بەرنە بەر توندوتیژیی لە دژی لایەنێکی تر، یان دەسەڵاتدار بۆ بەدیهێنانی مافەڕەواکانی خۆیان، مادام هاوبەشن لە وڵاتێك و پەیوەندییەك بەیەکەوە گرێیان دەدات و پاراستنی ئاسایش و سەقامگیری ئەو وڵاتە لە ئەستۆی ئەوانە، شێوازی ئاشتییانە لە کۆتاییدا بە سوود دەگەڕێ بۆ موسڵمانان خۆیان و دەتوانن بانگەوازی هەق بدەن بە گوێی خەڵکیدا و ڕێگرتن لە بەدەستەوەدانی بیانوو بۆ دەستدرێژییکردنە سەریان بڵاوکردنەوەی فەساد و خراپە و بەو شێوە دەتوانن بەشداری سیاسییان هەبێت، کارلێکردنیان لەگەڵ هاووڵاتیان هەبێت بە گشتیی و لە هەوڵی چاکسازیدا بن بە فیکرێکی ئیسلامییەوە.

## شەڕی ناوخۆ:

گرنگە ئاماژە بە حاڵەتێکی تر بدەین کە جیاوازە لەو حاڵەتانەی پێشتر، ئەویش شەڕی ناوخۆیە کە زۆر کات لەو وڵاتانەدا زۆر زەق دەبێتەوە کە تازە دامەزراون و کاریگەری داگیرکەرانیان لە سەرە و بیری دەمارگیریی ڕەگەزیی تێیدا زاڵە و هەر لایەك دەیەوێت خۆی زاڵ بێت.

دوای ئەوەی داگیرکەران ویست و پیلانیان هەبووە بۆ بەردەوامی دەسەڵاتیان لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا و ئەویش بە هۆی ئەوەی ئەو وڵاتانەی پێکیانهێنا زیاتر لە یەك نەتەوەو ڕەگەزی لەخۆدەگرت، ئەوەش بووە هۆی ململانێی نێوان ئەو نەتەوەو ڕەگەزانە و هەوڵی زاڵبوونی ڕەگەزێك بە سەر ئەویتردا، ئەمەش بە بەردەوامی هۆکاری شەڕ و پێشیلکردنی مافی مرۆڤ و ڕووداوی خوێناوی و هەر لایەك هەوڵی ئەوە بدات لە زوڵم و ستەمی لایەنی زاڵ خۆی ڕزگار بکات. ئەم حاڵەتە زیاتر لە ململانێی نێودەوڵەتی دەچێت وەك لە شەڕی ناوخۆی یەك وڵات، هەربۆیە کاتێك ئەو شەڕە پەرەی سەند و گەورە بوو وڵاتان بۆیان هەیە لایەنەکانی ئەو شەڕە وەك سەربازانی شەڕی نێودەوڵەتی لە قەڵەم بدەن و چەندەها یاسای نێودەوڵەتی لە هەندێك ڕووەوە پارێزگارییان لێ دەکات، دەبێت هێزی نێودەوڵەتی تەدەخول بکات بۆ یەکلاکردنەوەی و جا بە چارەسەرێك بێت کە مافی هەموو لایەك پارێزراو بێت، یان بە سەربەخۆیی بەخشین بە لایەنەکانی ململانێ و شەڕەکە.

ئەم حاڵەتە هۆی دروستبوونی هەندێك لە دەوڵەتان بووە، نموونەی کۆماری ئێرلەندا کە بەشێك بوو لە بەریتانیا و دواتر سەربەخۆیی وەرگرت و بوو بە نوێنەری کاسۆلیکەکان.

ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە زۆرێك لە گەلانی موسڵمان دەوڵەتە زلهێزە داگیرکەرەکان خستوویانەتە ئەو حاڵەتەوە و خەڵکانێك بوون بە دەسەڵاتدار کە

دژی موسڵمانن و مافی خۆیان پێ ڕەوا نابینن، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی ئەو گەلانە زۆربەی کات لە شۆڕش و هەوڵی بەدەستهێنانی مافی خۆیان بن، لە وڵاتانی ئەفریقا و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا نموونەی گەلی موسڵمانمان زۆرە کە لە ژێر دەسەڵاتێکی ستەمکاردان، بەڵام ئەوەی سەرسوڕهێنەرە ئەوەیە کە دوای ئەو هەموو زوڵم و ستەمەی لێیان دەکرێت وڵاتە ڕۆژئاواییەکان مافی بەرگری بە و گەلە موسڵمانە چەوساوانە ڕەوانابینن و بە بەرگرییەکی شەرعی بە پێی یاسای نێودەوڵەتی لە قەڵەم نادەن و مافی چارەنووسیان پێ ڕەوانابینن، تواناو هێز و بەرگرییان لە دژی دەوڵەت وەك کارتێکی فشار بەکار دێنن بۆ بەدەستهێنانی مەرامەکانی خۆیان وە هەندێك جار چاکەی وڵاتانی ڕۆژئاوا بە سەر ئەو گەلە چەوساوانەوە ناوبردنیانە بە (تیرۆریستی ئیسلامیی).

بەم شێوەیە دەبینین کە ململانێ لە نێوان نەتەوە و ڕەگەزە جیاوازەکان لەو وڵاتانەی کە دەوڵەتانی ئیمپریالیستی بە مەبەست چەند نەتەوەیەکیان تێکەڵ کردووە، بە ململانێی ناو یەك دەوڵەتی یەکگرتوو کە ئینتیمایەکیان هەیە بۆ وڵات و نشتیمانێك کۆیان دەکاتەوەو بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە، دانانرێت، بەڵکو شەڕی ناوخۆیی لەو وڵاتانەدا بە شەڕێکی نێودەوڵەتی لە قەڵەم دەدرێت و توندوتیژیی لایەنی چەوساوە نابێت بە (تیرۆر) لە قەڵەم بدرێت.

تێگەشتن و بەرچاوڕوونی سەبارەت بە جۆرەکانی ململانێ و جیاوازییە کۆمەڵاتییەکانی، کارێکی زۆر پێویستە بۆ ئەوەی چارەسەرێکی دادپەروەرانەی بۆ بکرێت و مرۆڤایەتی بەرەو بنەماکانی دادپەروەری و ئاشتی ببرێت، دادپەروەری و ئاشتی دوو بنەمای هەرە سەرەکی ژیانی مرۆڤایەتین کە شارستانییەتی مرۆڤایەتی دەبێت هەوڵی جێگیرکردنیان بدات و بە هۆی ئەو دووانەوە خۆی بپارێزێت لە ڕووخاندنی خودی خۆی بەو تەکنەلۆجیا سەربازییەی لە دەستی دەسەڵاتداران و سیاسەتمەداراندایە.

# گەڕانەوە بۆ سەرەتا:

# دەردی دەمارگیریی حەیوانیی خۆزاڵکەر و دەوای دادپەروەریی برایەتی مرۆیی[٢٢]

[٢٢] دەردی دەمارگیری خۆزاڵکەر لەم سەردەمەدا وڵاتانی نەتەوەیی خۆپەرستی ئیمپریالیستی دەگرێتەوە.

ئەو پرسیارەی کە دەبێت بە باشی وەڵامی بدرێتەوە ئەوەیە کە: کێ بەرپرسیار و هۆکاری ئەو شاڵاوە توندوتیژییەیە لە جیهاندا؟! چۆن ئاگری توندوتیژیی تەڕ و وشك و تاوانبار و بێتاوان دەسووتێنێت و ملیۆنەها مرۆڤ زەرەرمەند بوون لێی و بە بێ جیاوازی لە نێوان مەدەنی و سەربازی؟! ئەی ئەم بانگەشە دژ بە یەك و گفتوگۆ بێ سەروبەرەی نێوان سەرکردەکانی جیهان چییە هەتا وای لێ هاتووە ناتوانن لە سەر هیچ شتێك پێك بێن و بە یەك پێوانە هەڵسەنگاندن بکەن؟! ئەی تیرۆر و بەرگری جیاوازییان چییە؟! یان کێ دەستدرێژیکارە و کێ دەستدرێژی کراوەتە سەری؟! ئەی ڕۆڵی ئایین و شارستانییەتەکان چیە؟! ئەی بۆ ئیسلام بە تەنها و بەدەر لە ئایین و شارستانیەتەکانی تر کە شەڕ و توندوتیژیی ئەوان زیاتریشە، بە دەستدرێژیکار و دوژمنکار ناوی دەبرێت؟!

بە ڕاستی جێگای سەرسوڕمانە کاتێك بەو ئەندازەیە خراپە بەرامبەر بە ئیسلام بکرێت و بە پێچەوانەی سروشتی خۆی ناوزەد بکرێت، چونکە وەك دەزانین ئیسلام لە ڕاستیدا ئایینی ئاشتی و یەکێتی و برایەتی و دادپەروەری و بەرپرسیارێتییە، لە هەموو کەس زیاتر ژیانی مرۆڤ بە پیرۆز دەگرێت و پارێزگاری لێ دەکات و نەیهێشتووە ژیانی مرۆڤ لە ناوببرێت تەنها لە کاتی شەڕێکی دادپەروەرانە و بەرەنگاربوونەوەی دەستدرێژیکار نەبێت، تەنها کەسانێك دەکاتە ئامانج کە ناچاریی بێت.

ئایینی ئیسلام ئایینێکە کە سەرەکیترین هۆکاری دووبەرەکی ناهێڵێت، کە ئەویش دەمارگیرییە، سەرەکیترین هۆکاری زوڵم و ستەم ناهێڵێت، کە خۆپەرستی ئاژەڵییە، هەموو ئەو دەستدرێژییانەی لە مێژووی مسوڵماناندا ڕوویداوە — کە بەراورد ناکرێت لەگەڵ هی میللەتانی تر— هۆکارەکەی پاشماوەی قۆناغی جاهیلی و کەلتوری ئەو میللەتانە بووە کە مسوڵمان بوون، هەربۆیە مێژووی ئیسلام پاکە لە ڕووداوی دەستدرێژی گەورەی دەمارگیری، کە مێژووی میللەتانی تری پیس

کردووه، هەروەها شارستانییەتی ئیسلامیی پاکە لە ئاراستەکردنی زانست و پێشکەوتن بۆ دروستکردنی ئامرازی کاولکاری، بەڵکو تەنها بۆ بوژانەوەو پێشکەوتن و ئاوەدانی بەکاری هێنا.

هێرشکردنە سەر دوژمن بە شەو و لە ناکاتدا پرسێکی گرنگ بوو لە فیقهی ئیسلامییدا و بووبوو بە کێشەی زانایان لە ترسی ئەوەی کە خەڵکی بێتاوان پێوە دەبێت، هەر بەو هۆیەوە ڕیگەیان پێنەدەدا تەنها لە ئەوپەڕی پێویستیدا نەبێت، وەك سەرکەوتنی دوژمن و شکستی لایەنی هەق.

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ئیسلام بەو هەموو باشییەوە، دەکەوێتە بەر هێرشی وڵاتانی ئیمپریالیستی کە مێژوویان پڕە لە نەهامەتی و کاولکاری و قەسابخانە بۆ چەندەها سەدە لە دژی کەمینە نەتەوەیی و ئایینییەکان و مەحاکمی تەفتیش و قەتلّ و عام کردنی چەندەها گەل و هۆز لە هەردوو ئەمریکای باکوور و باشوور، تاوانەکانی ئیمپریالیست لە ئاسیا و ئەفریقا، کۆمەڵکوژییەکانی نازییە فاشییەکان و ستالینییەکان و شەڕە وێرانکارییەکانی هیند و چین بە ناپاڵم و چەکی کیمیاوی و چەکی ئەتۆمی لە ناکازاکی و هیرۆشیما، ئەو کوشتار و دەربەدەرکردن و داگیرکارییانەی لە فەلەستین دەکرێت، یان شەڕی جیهانی یەکەم و دووەم، کە سەدەها ملیۆن خەڵکی تێدا لە ناوچوو....

شارستانییەتی دەمارگیری خۆپەرست ئێستا عەقلّ و ژیری خۆی بەکاردەهێنێت بۆ داهێنانی ئامرازی وێرانکەر کە دەتوانن لە ساتێکدا هەموو جیهان لەناوببەن، ئەو شارستانییەتەی بواری بۆ ئاشتی و ئارامی نەهێشتۆتەوە، شوێنێك بۆ چەوساوە نییە پەنای بۆ ببات، وێرانکارییەکانی تاوانبار و بێتاوان دەگرێتەوە و تەنها مەبەستی ئەوان پیلانە ستراتیژییەکانی خۆیانە، لە گەڵ ئەمانەشدا بانگەشەی ئەوە دەکات شارستانییەتێکی مرۆییانەیە و مافی مرۆڤ دەپارێزێت و پێشکەوتن و بوژانەوە بە دەست دێنێت.

مرۆڤ کاتێك پێی دەڵێن مرۆڤ لە بەر ئەوە نییە کە ماسولکەی بەهێزەو هەڵمەتبەرەو خوێنڕێژە، بەڵکو ئەمانە لە نوقسانییەکانێتی، بەڵام مرۆڤە بە بەها و ڕەوشتی جوان و هەوڵی چاکەکردن و پەیڕەوی دادپەروەری و ئاوەدانکردنەوەی زەوی (ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ) (البلد: ١٧).

ئەوەی لە شەڕ و نەهامەتی ڕوودەدات لەم سەردەمەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە شارستانییەتی سەردەم واتاکانی برایەتی و دادپەروەری لە پەیوەندی مرۆڤایەتیدا تێدا نییە، هەر ئەو حەز و ئارەزووە دەمارگیرییە خۆپەرستانەیە مرۆڤایەتی پەلکێش دەکات بۆ ئەو بیروبۆچوون و فیکرانەی کە جیاوازی دەخەنە نێوان بەهای گەلان و دەستدرێژی و ستەم، کە لە چاوی هەندێکدا دەیڕازێننەوە بە ناوی بەرژەوەندی نەتەوەیی، چەواشەکاری ڕاگەیاندن و دوو پێوانەیی دەهێنێتە کایەوە.

ئەوەی کە جێگای مەترسی گەورەیە ئەوەیە کە وتەی ناهەق سەرکەوێت و ستەم و دەمارگیری و خۆپەرستی بەرگی پێشکەوتن و مرۆڤایەتی بکرێت بە بەریدا، ئەگەر مرۆڤایەتی نەیەتەوە هۆش خۆی و دژایەتی ئەو حەز و ویستە نامرۆییانە نەکات، ئەوا بەرەو نەمان دەچێت، دەبێت بۆچوونی خۆی بەرامبەر بە ئیسلام و پەیامەکەی دادپەروەرانە بێت و سوودی لێ ببینێت لە دژایەتی ئەو خۆپەرستی و ویستە نامرۆییانە، دەبێت جارێکی تر برایەتی و دادپەروەری و ئاشتی بگەڕێتەوە بۆ جیهان.

دەبێت گەلانی موسڵمان و گەلانی تری چەوساوە بە ئینسافەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت و مافەکانیان بۆ بگێڕدرێتەوە، ئەوەی لە زۆربەی وڵاتاندا ڕوودەدات تەنها دەرەنجامی کرداری دوژمنکارانەی دەاگیرکەران و ستەمکارانە و ئەوەی گەلانی چەوساوە دەیکەن لە بەرگریی، مافی خۆیانە، بەڵام بەهۆی باڵادەستی ڕاگەیاندنی لایەنی ستەمکار بەرگریی لایەنی چەوساوە بە تیرۆر و دوژمنکارانە لە قەڵەم دەدرێت.

گومانی تێدا نییە ئاشتی و ئاسایش لەم جیهانەدا بەرپا نابێت بە برایەتی و دادپەروەری و هەستی بەرپرسیارێتی نەبێت، بە وازهێنان لە دەمارگیری و ویستی زاڵبوون و خۆپەرستی، هەروەها بە تێگەشتن لە بنەماکانی ئیسلام و ئامانجە بەرزەکانی لە دادپەروەری و بڵاوکردنەوەی هەستی برایەتی، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەو بانگەشە درۆیانەی ڕاگەیاندن، چونکە ئەوە هیچ لە ڕاستییەکان ناگۆڕێت و هەتا لایەنی دەستدرێژیکار نەیەتەوە هۆش خۆی و واز لە ستەم و فیکری فاسید و کەلتوری خراپی خۆی نەهێنێت، ئەوا هیچ کات ئاشتی و برایەتی ناگەڕێتەوە بۆ ئەم سەر زەمینە و کەس بە خەیاڵی ئاسوودەوە ناژی.

ڕێنماییەکانی قورئان و مەنهەجی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیە کە لە کێشەو ململانێی سیاسیی ناو یەك کۆمەڵگای یەکگرتوو نابێت بە هیچ شێوەیەك توندوتیژیی بەکاربێت بۆ چارەسەری کێشەکان و ئەوەی سیاسییە دەبێت بە ڕێگەچارەی سیاسییانە و ئاشتییانە چارە بکرێت، کاروباری ئوممەت دەبێت بە شورا بێت، بەڵام ئەگەر لایەنێکی کێشەکە دەستدرێژی کردە سەر لایەنێکی تر و هێزی بەکارهێنا، لەو حاڵەتەدا دەسەڵاتی شەرعی ڕێپێدراو لە لایەن ئوممەتەوە هەڵدەستێت بە چارەسەری کێشەکە لە ڕێگای ئاشتییانەوە، بەڵام ئەگەر لایەنی دەستدرێژیکار سوور بوو لە سەر کردەوەی خۆی، واجبە لایەنی دەسەڵات ڕێگری لێ بکات و لە سنووری خۆیدا ڕایگرێت بە هەر شێواز و ئامرازێك کە دۆخەکە بیخوازێت، بە بەکارهێنانی توندوتیژیی و هێزیشەوە، دیارە ئەم حاڵەتە لە کاتێکدا دروست دەبێت کە جەماوەر بڕوای بە ڕێگەچارەی ئاشتییانە نابێت بۆ چارەسەری کێشەکانی ناوخۆیان، ئەگەرنا بۆ هیچ لایەنێك نییە پەنا بباتە بەر بەکارهێنانی توندوتیژیی با لایەنی دەسەڵاتیش بێت، چونکە جەماوەر ئەو هەڵوێستە قەبوڵ ناکەن و دەستبەرداری دەبن و ئەوکات هێزو توانای نامێنێت.

سەرکەوتووترین نموونەی بەرەنگاربوونەوەی ستەم و زوڵم لە لایەن جەماوەرەوە شۆڕشی ئیسلامیی ئێران بوو، کە توانا و ئیرادەی سوپا ڕووخا لە بەرامبەر جەماوەری ئاشتیخوازی بێ چەك، پڕزەرەرترین نموونەش دەکرێت نموونەی جەزائیر بێت، کاتێك کۆمەڵێك لە ئۆپۆزسیۆن پەنایان بردە بەر توندوتیژیی و لە دژی دەسەڵات وەستانەوە، کە بووە هۆی شەڕێکی خۆیناوی درێژخایەن و دەیەها هەزار خەڵکی تێدا کوژرا لە هەردوولا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئوممەت هێزی نەمێنێت و بێتوانا بێت.

ئەگەر ستەم و زوڵم لە لایەنێکی بیانییەوە بوو، بەڵام خەڵکانی ناوخۆ و هەندێك لە گەلی بەکاردەهێنا وەك داردەست، لەم حاڵەتەشدا هەمان یاسا و ڕێسای بەکارنەهێنانی توندوتیژیی پەیڕەو دەکرێت، چونکە مەبەستی داگیرکەری بیانی

ئەوەیە کە وڵات بێهێز بێت بۆ ئەوەی بە ئاسانی زاڵ بێت بە سەریدا، بەڵام ئەوەی پێویستە ئەوەیە کە دوژمن و بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی بکرێنە ئامانج بۆ ئەوەی ناچار بکرێت دەست هەڵگرێت لە ستەم و دەست درێژییەکەی، تا چەندە پابەندی هەبێت بەم مەنهەجەوە ئەوەندە زەرەر کەمتر دەبێتەوە و دەستکەوتەکان زیاتر دەبن و هاریکاری نێوان گەل و پشتگیرییان بۆ لایەنی هەق زیاتر دەبێت، نموونەی ئەمە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی جەزائیری پێشتر بوو لە دژی جەزائیر لە فەڕەنسا، هەروەها بەرگریکارانی ڤێتنامی باکوور لە دژی داگیرکەری فەڕەنسی بە پشتیوانی ئەمریکا، یان موجاهیدانی ئەفغانی لە دژی داگیرکەری ڕووسی.

هەروەها نموونەیەکی تری زیندووی ئەمڕۆ، بزووتنەوەی بەرگریی فەلەستینە، کە لە دژی داگیرکەری زایۆنی و خۆلادان لە شەڕکردن دژی دەسەڵاتی فەلەستینی و ئاڕاستەکردنی هێرشەکانی تەنها لە دژی داگیرکەری بیانی، کە ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی پشتیوانی جەماوەری زۆر بێت.

بەرگریی فەلەستینی بە ناڕاستەوخۆ پاڵپشتێك بووە بۆ دەسەڵاتی فەلەستینی لە کاتی دانوستان و داواکارییەکانیدا لەگەڵ داگیرکەردا.

حاڵەتی ململانێی نێودەوڵەتی و نێوان وڵاتان و کۆمەڵگە جیاوازە سەربەخۆکان مامەڵەیکی تری هەیە، لەم حاڵەتەدا ڕێنمایی قورئانی پیرۆز و مەنهەجی پێغەمبەر (ﷺ) مامەڵەکردنە ڕاستەخۆ لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتانەدا نەوەك لەگەڵ جەماوەر، ئیتر هێنانەدی هەق بە دانوستان و گفتوگۆ و ڕێگای ئاشتییانە بێت، پەیمان و ڕیکەوتن هەبێت لە نێو هەردوولا و ئەوان و موسڵمان لە ئەرك و مافدا بەشداربن، ئەگەرنا بەکارهێنانی توندوتیژیی و هێز و هەر ئامرازێکی پێویست بە بێ زیادەڕەوی شتێکی ڕێپێدراوە، چونکە جەماوەر و گەل هەموو کات شوێنکەوتەی دەسەڵاتادارانی وڵاتەکەیانن و هەر پێشنیارێك لە دەسەڵاتەوە بێت چاك بێت یان خراپ ئەوان تەنها شوێنکەوتەن، نامەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ

کیسراکان و قەیسەرەکان ئەوە دووپات دەکاتەوە کە مامەڵە دەبێت لەگەڵ دەسەڵاتدار بێت، بە ئاشتی بێت یان بە شەڕ.

کۆچکردن وەك ڕیگەچارەیەك و شێوازێکی مامەڵە لەگەڵ ململانێکاندا لە کاتێکدا دەبێت کە توانای جەماوەر بیهێز دەبێت لە پشتگیری کردنی لایەنی ستەملێکراوی ناو کۆمەڵگە، مەبەستەکەش یان دەربازبوونە لە فەوتان، یان بۆ دروستکردنی بنکەیەك و پێکەوەنانی کۆمەڵێك بۆ بەرنگاربوونەوەی ستەم و کارکردن بۆ ئازادی ویست و ئیرادەی گەل و نەهێشتنی ستەم لە سەریان، هەتا دادپەروەری بێتە کایەوەو موسڵمان و ناموسڵمان ماف و ئەرکی خۆیان بەدەست بێنن، شوێنی کۆچی موسڵمان هەموو کات دەبێت شوێنی چاکسازیی و بانگەواز و ڕێنمونیی خەڵکی بێت.

سەبارەت بە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە لە ناو کۆمەڵگەدا ئامانجێکی ئیجابی هەیە، ئەویش هێنانەدی چاکە و ئامۆژگاری کردنی خەڵکی و کارکردن بە شێوازی ئاشکرا و نهێنی بە شێوازی ئاشتییانە، هەتا بەرامبەر ئەوانەی کە بەردەوامن لە سەر خراپەکانیان، هیچ کات مەبەست لە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە لە لایەن تاکەکانی کۆمەڵگەوە ئەوە نییە کە بە توندوتیژیی بەرەنگاری خراپەکاران بێتەوە و هەوڵی ڕێگرییان بدات بە هەر شێوازێك بێت، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی پەرتەوازەیی و دروستبوونی فیتنە و بە گژداچوونی دەسەڵات، یان کاتێك دەسەڵات خۆی سەرچاوەی خراپە و فەساد بێت ئەوە لە توانای تاك و گرووپەکاندا نییە کە ڕاستی بکەنەوە، بەڵکو مافی ئوممەت بە گشتیی و ئەهلی شورا و ڕێبەرانی ڕای گشتییە کە بەو کارە هەستن، چونکە وەك وتمان هەتا دەسەڵاتیش بەرگەی ڕووبەڕووبوونەوەی جەماوەر ناگرێت، بەڵام کاتێك گرووپێك بەرامبەر بە گرووپێکی تر دەوەستێتەوە، ئەوە سەردەکێشێت بۆ پەرتەوازەیی و فیتنە و خوێنڕشتن و جێگیربوونی فەساد و ستەمکاری، ئارامگرتنی بانگخوازان و داواکارانی مافی ڕەوا و بەردەوامبوون لە سەر ڕێگەچارەی ئاشتییانەیە.

له کۆتاییدا دەبێت ڕۆڵی دادپەروەرانەی دەسەڵات بۆ خۆی ڕابکێشێت، ئەگەرنا پشتیوانی کۆمەڵگە و سۆز و بەزەیی هاووڵاتیان و ڕێبەرانی ڕای گشتیی ڕادەکێشێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی لایەنی ستەمکار.

بنەمای پابەند بوون بە شێوازی ئاشتییانەوە لە بانگەواز و چاکسازی و داواکردنی ماف و کێشەی سیاسیی لە ناو کۆمەڵگەدا هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگە دەگرێتەوە بە کەمینە و گۆچکردوەکان بۆ وڵاتانی ناموسڵمان، چونکە ئەو وڵاتانە وەك وڵاتی خۆیان حیسابی بۆ دەکرێت و مافی بەشداری پرۆسەی سیاسیی ئاشتییانەیان هەیە و دەتوانن کاریگەر بن لە داڕشتنی سیاسەتی ئەو وڵاتانەدا، بەڵام بەکارهێنانی توندوتیژیی و هێز لەو کێشانەدا دەبێت کە لە نێوان دوو دەوڵەتدا ڕوو دەدات دوای ئەوەی کە ڕێگەچارەی ئاشتییانە کێشەکەی چارەسەر نەکرد.

سەبارەت بە پەیەندی نێوان ئایینەکان و شارستانییەتەکان دەبێت بەشێوازێکی حەکیمانە و چاکەخوازیانە بێت و بۆ بەدیهێنانی هەق و چاکسازی و خۆشگوزەرانی دنیا و ئاخیرەتیش بێت، لە گفتوگۆی نێوان ئیسلام و ڕۆژئاوادا دەبێت ئامانج لێك تێگەشتن و ڕێککەوتن و یەکتر تەواوکردن بێت. هەر لایەك هەندێ شتی هەیە کە لایەکەی تر پێویستی پێیەتی و سودمەند دەبێت لێی، لە سەر هەر لایەکە کە پشتگیری و هاوکاری لایەکەی تر بەدەست بهێنێت بۆ پێکهێنانی شارستانییەتێکی جیهانی مرۆیی، ڕەچاوی لایەنی ماددی و ڕۆحی و خۆشگوزەرانی و داهاتوویی تێدا بکرێت. ڕۆژئاوا بە تەکنەلۆجیا و زانست و ئەزمونیانەوە قۆناغێکی باشیان بڕیوە لە پێشکەوتن، ئەویش بە هۆی ئەو مەنهەجە زانستییەی پەیڕەویان کردووە.

ئیسلام لە بەرامبەردا دیدێکی گشتگیری بۆ گەردوون هەیە و لایەنی بەهێزی لە ڕۆح و بەهاو ڕەوشت و دروستی کۆمەڵگەدا باڵادەستەو هەر لایەك لەمانەش بگریت گرنگی خۆی هەیە و ڕەگی لە ناخی مرۆڤایەتیدا هەیە و هیچ لایەك ناتوانن ئەویتر

له ناوبەرن و ئەو ململانێیە تەنهاماڵوێرانی و زەرەری خود و بەرامبەری تێدایە، بۆیە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بیرمەندان و عاقڵانی هەردوولا بیر لەوە بکەنەوە کە لە هەوڵی گفتوگۆ و پێداچوونەوەی هەڵوێست و سیاسەتی چاکسازی و پەیوەندی دۆستانە دروستکردن و هاریکاریکردنی یەکتر، بۆ دروستکردنی شارستانییەتێك کە مادده و ڕۆح، پێشکەوتن و دادپەروەری، دەستکەوت و تەزکیە، ئازادی و چاکسازی، جیهانی مادده و غەیب پێکەوە کۆ بکاتەوە.

لە کۆتاییدا هیوام وایە کە لێکۆڵینەوەکە زانیارییەکی نوێی پێشکەش کردبێت و بووبێتە هۆی واڵاکردنی دەرگای گفتوگۆیەکی زانستیی مەنهەجیانەی ئیسلامیی، بە شێوازێکی گشتگیری شیتەڵکاری سەبارەت بەم پرسە عەقیدەیی و فیکریی و کۆمەڵایەتییە گرنگە، کە پەیوەستە بە بینای فیکری عەقڵیەتی موسڵمان و کەلتور و پرۆگرامی پەروەردە و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی، بە شێوازێك کە دەرەنجامەکەی دۆزینەوەی کەموکوڕی بێت لە بینای فیکریی عەقڵیەتی موسڵمان و کەلتور و پرۆگرامی پەروەردە و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکاندا، هەتا بتوانین توانای خۆمان بگێڕینەوەو ڕێڕەوەکەمان ڕاست بکەینەوە و توانا شاراوەکانمان بخەینەوە کار بۆ بەشداریکردنێکی چالاکانە لە دروستکردنی شارستانییەتێکی مرۆییانەی سەردەم و ڕێنماییکردنی خەڵکی بۆ ئاشتی و برایەتی دادگەری.

هەروەها هیوام وایە ئەم لێکۆڵینەوەیە توانیبێتی یەکێك لە کەموکوڕییەکانی مێژووی ئیسلامیی ڕوون بکاتەوە، ئەویش شکستی توندوتیژییە لە بەدەستهێنانی چاکسازی و نەهێشتنی ستەمە بە درێژایی چەند سەدەیەك، هەرچەندە هەوڵی زۆر دراوەو خوێنی زۆر ڕژاوە، بەڵام بێ سوود بووە. هیوام وایە ئەم لێکۆڵینەوەیە کاریگەری هەبێت لە پەیڕەوکردنی بنەمای شورا و ئامرازی ئاشتییانە و مەدەنییانە وەك تەنها ئامراز بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئوممەت و پرۆسەی چاکسازی و دانانی سنوور بۆ ئەو فەساد و گەندەڵییەی هەیە لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا.

دەكرێت دەرەنجامی ئەم لێكۆڵینەوەو چەندەها لێكۆڵینەوەی ترم[٢٣] كە مەنهەجێكی زانستی گشتگیری تێدا پەیڕەو كراوە، هۆكارێك بێت بۆ تێگەشتنی شكستی ئوممەت لە سەدەكانی ڕابردوودا، بێتوانایی فیكری لە پێشكەوتن و گرتنەخۆی گۆڕانكارییە كاتی و شوێنییەكان. دەكرێت ببێتە هۆی كاراكردنی فیكری ئیسلامیی سەردەم و گەڕاندنەوەی تواناكانی و گێڕانەوەی قەناعەتی ئوممەت بەم مەشروعە ئیسلامییە و توانای لە تێپەڕاندنی ئەو قەیرانە شارستانییەی كە تا ئێستاش ڕووبەڕووی بۆتەوە.

بە ڕای من خاڵێكی گرنگی سەرەكی بۆ ئەوەی چاكسازی پەروەردەو مەنهەج كاریگەری هەبێت ئەوەیەكە: پرۆگرامی پەروەردەی زانستی ئیسلامیی دابڕژرێتەوە و هەموو ئامرازەكان لە هەموو لایەنەكانی زانست بۆ پێكهاتەی عەقڵییەتی تاكی موسڵمان تەواو بكرێت بە عەقڵییەتی یاسایی فەقیهەكانەوە، هەروەها لایەنەكانی تری زانستی ئیسلامیی بە وەحیی و عەقڵ و سروشتی مرۆڤەكان و واقیع بە شێوەیەك دژ بە یەك نەبن بە هۆی نەشارەزایی لە ئایین یان لە زانست یان لە تێگەشتن. دەبێت مەنهەجی فیكری و زانستی زانایان گۆڕانكاری تێدا بكرێت، نابێت زانیاری تەنها یەك لایەن بگرێتەوە بە تایبەتی خوێندكارانی زانستی شەرعی نابێت زانیارییان تەنها زانست و ڕێگەچارەو زانستی زمانەوانی مێژوویی بخوێنن، چونكە تەنها دووبارەكردنەوەی ئەو ڕێگەچارانەی پێشتری لێ بەدی دێت و سوودێكی ئەوتۆی نابێت و زانیارییەكان پەیوەست دەبن بە شێوازێكی تایبەتی ئامۆژگاری ئایینی و هەندێك كتێبی ئایینی سنووردار.

---

[٢٣] لێكۆڵینەوەكانی تر وەك: (نظرية الاسلام الاقتصادية) (النظرية الاسلامية فى العلاقات الدولية) (بحث السياسة و الحكم فى الاسلام- ندوة العالمية للشباب الاسلامى. رياض-١٩٧٣) (اسلامية المعرفة- العلوم السياسية نموذجا) (ازمة العقل المسلم).

گومانم نییە کە پرۆسەی چاکسازی فیکری لە هەندێ شوێن چرۆی کردووە، بە تایبەتی ئەزمونی زانکۆی ئیسلامیی جیهانیی مالیزیا کە کۆمەڵێك کەسایەتی ئیسلامیی چاوکراوەی ئامانجداری پێگەیاندووە کە توانایی و کاریگەرییان پێوە دیارەو دەکرێت وەك سەرکردەی سەرکەوتووی کۆمەڵگە و بورای خۆیان حیساب بکرێن، وەك سەرەتای ئەزمونێکی سەرکەوتوو بێت کە مەنهەجێکی زانستی شارستانانە لە خۆ بگرێت و پسپۆڕانی مسوڵمان لە بوارەکانی کۆمەڵناسی و ئابووری و پەروەردە و سیاسەت و فەقیهی یاساناس و بانگخوازی ڕێنمونیکاری عەقیدەی پاکیش لە خۆبگرێت.

گرنگ ئەوەیە کە ئەو پرۆسەی چاکسازییەی لە بواری پەروەردەو زانستدا هەوڵی بۆ دەدرێت کەسایەتی موسڵمان هەر لە منداڵییەوە بگرێتەوە، هەر لە گەشەی مناڵەوە لە ناو خێزاندا، بۆ ئەوەی هەموو ئەو خلّتە و خاشاکەی تێکەڵ بە پەروەردەی منداڵ بووە لە ڕووی عەقیدە و مەنهەج و ڕۆشنبیری و زانستەوە پاڵفتە بکرێت و نەهێڵرێت، بنیاتی دەروونی بە شێوازێکی دروست بکرێت و جیاواز لەوەی کە ئەمڕۆ هەیە، چونکە بە گشتیی ئێستا ڕەشبینی و خۆپەرستی بەسەر دڵەکاندا زاڵە، ئەمەش ئامانجی ئەوەیە کە تاکێکی بەرهەمهێنی نەفس بەرزی دوور لە هەستی خۆ بە کەم زانین و ترس و هەموو ئاستەنگە دەروونییەکان بێت، دەروونی وەك بەندە نەبێت، مەبەست لە بەندەی سەربەرز نییە، چونکە جیاوازی هەیە کەسێك بە ویست و ئیرادەی خۆی ملکەچی پەروەردگار دەبێت کە ئەمە جێگای ڕێز و سەربەرزییە، نەوەك بەندەیەك بە هۆی نەفسیەتی ڕووخاو و نەزانی سەرشۆڕییەوە خۆی زەلیل بکات، هەر ئەم دەروونە پڕ ترس و خۆ بە کەم زان و ڕەشبینە زۆرینەی تاکەکانی ئوممەتی گرتۆتەوە، هەر لەو سەردەمانەی کە داڕووخان ڕووی کردە وڵاتانی ئیسلامیی، هەر ئەمەش هۆکاری نەبوونی ڕۆڵی ئوممەت و ستەم و بێتوانایی سەرکردەکان و دواکەوتوویی شارستانی و ئاوەدانی ئوممەت هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆ.

ئەوەی موسڵمانان پێوەی دەناڵێنن قەیرانێکی مەنهەجی فیکری و پیسبوونی کەلتور و تێکچوونی دەروونییە، هەربۆیە پڕۆژەی چاکسازی لە مەنهەج و فیکر و پەروەردەدا پێویستە، دەبێت زۆر بە جیددی ئەنجام بدرێت و گرنگی پیَ بدرێت، هەتا بتوانێت کەموکوڕییەکان چاك بکاتەوەو نەوەیەکی نویَ بەرهەم بهێنێت کە جارێکی تر پەیامەکە هەڵگرێت و بە سەر هەموو ئاستەنگەکانی ڕێگەدا زالْ بێت.

گرنگه ئاماژەیەك بدەم بە میتۆدی ئەم لێكۆڵینەوە كە هەندێك ڕەهەندی لە خۆگرتبوو كە دەبێت لە لێكۆڵینەوەكانماندا ڕەچاوی بكەین، هەتا لەو كەموكوڕیانە ڕزگاری بێت كە تا ئێستاش گرفتی زۆرێك لە لێكۆڵینەوەكانە.

سەرەتا هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانەی پەیوەستە بەم بابەتەوەو نووسەرانی ئەم بابەتە ئاماژەی پێ دەكەن، ڕاڤەم كردووە بە شێوەیەكی دروست و پشتم بەستووە لە ڕاڤەكردنیدا بە قورئان و سوننەتی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها لێكۆڵینەوە سیاسییەكان، بۆ ئەوەی هیچێك لە پرسە گرنگەكان بە هەڵواسراوی نەمێنێتەوە.

هەروەها لەم لێكۆڵینەوەدا پشتم بەستووە بە قورئان و فەرموودەی سەحیح لە ڕووی مەتن و سەنەدەوە، هەروەها بنەماكانی عەقڵ و سروشتی مرۆڤەكان و سوننەتی ژیانی كۆمەڵگەكان و زانستە مرۆییەكان، بۆ تێگەشتنی واقیعی ژیان و ڕووداوەكان و ڕەچاوی كات و شوێنیان و مەبەستەكانی وەحیی لە دنیا و لە قیامەت.

لە مامەڵەم لە گەڵ دەقەكاندا، قورئانی پیرۆز وەك ئەسڵ و پێوەر بۆ فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بەكارم هێناوە، كردارەكانی پێغەمبەر (ﷺ) وە سیاسەتەكانی لە كاتی ئاشتی و جەنگ و مەقاسیدەكانی لە دادپەروەری و سۆز و مەنهەجی شورا، یارمەتیدەر بوون لەم كارەدا، هەروەها تێگەشتن لە ئاماژەكانی دەقەكانی فەرموودەو وردەكاری ئاماژەكانی پەیوەست بە كات و شوێن، ئەمانە وەك جێبەجێ كردنی كردەیی و نموونەیی پەیامی ئیسلام و سوننەتێك بۆ نەوەكانی دواتر بۆ ئەوەی چاوی لێ بكەن. ئەو ئاماژەانەی فەرموودە لە چوارچێوەی پێوەری قورئانیدا – كە شك و گومانی تێدا نییە – مامەڵەی لەگەڵ كراوە بۆ ئەوەی ئەو شتانەی بە هۆی ڕیوایەتكردنی فەرموودە بە واتا (رواية الحديث بالمعنى)، یان بە هۆی لێتێكەڵ بوون (الوهم) و ئیهمالی، یان بە ئەنقەست

شتی نامۆ تێکەڵکردنی (الدس)[٢٤]، کاریگەری هەندێك لەو شتە نادروستانەی خراوەنەتە ناو فەرموودەوە وای کردووە شتی پڕوپوچ و جادو و نەمانی ڕۆحی داهێنان و تەمبەڵی و تێکچوونی چەمکەکانی دروست ببێت لە ئیسلامدا.

لەم لێکۆڵینەوەدا مەنهەجێکی گشتگیری شیتەڵکاریم پەیڕەو کردووە بۆ ئەوەی هەموو لایەنەکانی کێشەکە بگرێتەوەو وێنایەکی تەواوی لیَ دروست ببێت و لایەنی ئایینی و مرۆیی دەرك بکرێت و دووربکەوینەوە لە تێڕوانینی جوزئی کێشەکە و هەروەها پێوانەکان کە پەیوەست بوون بە کات و شوێنی دیاریکراو لە مێژوودا کە ئێستا ئەگەر بە هەمان شێواز مامەڵەی لەگەڵ بکرێت دەکەوینە هەڵەی زۆرەوە.

ئەو دەرەنجامەی بە فەزڵی خوای گەورە ئەم لێکۆڵینەوە پێیگەیشتووە، هۆکارەکەی ئەو میتۆدە ئیسلامییە گشتگیرە شیتەڵکارییەیە پەیڕەوکراوە تێیدا، هیوام وایە جێگای گرنگی خوێنەر بێت بە ئەندازەی گرنگی پرسەکە، هەر کات شێوازی بیرکردنەوە و فیکر و مەنهەجی لێکۆڵینەوە دروست بوو، ئەوا هیدایەتی خوای گەورە و سەرکەوتن نزیکە.

نسأل الله السداد و الرشاد و آخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين.

---

[٢٤] من پێموایە تەواوی (متن) ناوەرۆکی فەرموودە بنەڕەتی کارپێکردنێتی، هەرکات مەتنەکە تەواو نەبوو ئیتر سەنەد هەرچەندە تەواو بێت ئیعتیباری بۆ نییە و کاری پیَ ناکرێت (ئەم ڕایە هی نووسەرەو ڕای تاکە کەسی خۆیەتی و زانایانی فەرموودە لەگەڵ ئەم ڕایەدا نین، واتە ئەگەر بە عەقڵی مرۆڤەکان تەواوی مەتن نەسەلمێنرا ئیتر واز لە فەرموودەکە بهێنن - وەرگێڕ)، وە ئەگەر مەتن تەواو بوو، بەڵام سەنەد کێشەی تێدا بوو ئەوە ناکرێت بڵێین فەرموودەیە، بەڵام دەتوانرێت وەك پاڵپشت سوودی لیَ ببینرێت، ئەگەر سەنەدەکە یەکجاری ناتەواو بوو ئەوە بە فەرموودە لە قەڵەم نادرێت، ئەوەی پەیوەستە بە شتە غەیبەکانەوە کە بواری عەقڵی تێدا نییە دەبێت یان بە قورئان یان بە فەموودەی (متواتر) بسەلمێت.

# ناوەرۆک

# د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان



* ساڵی ١٣٥٥ك/١٩٣٦ز لە مەککەی پیرۆز لەدایك بووە.

* قۆناغی سەرەتایی و دواناوەندی لە مەککە تەواوکردووە و لە ١٩٥٥ لە قوتابخانەی ئامادەیی نێردراوان بۆ دەرەوە دەرچووە.

* ساڵی ١٩٥٩ بەکالۆریۆسی لە بازرگانی لە زانکۆی قاهیرە بەدەستهێناوە.

* ساڵی ١٩٦٢ ماستەری لە زانستە سیاسییەکان لە کۆلێژی بازرگانی زانکۆی قاهیرە وەرگرتووە.

* ساڵی ١٩٧٣ دکتۆرای لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە زانکۆی پەنسلڤانیا بەدەستهێناوە.

* لە نێوان ساڵانی ١٩٦٤ – ١٩٨٦ سکرتێری کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی پلاندانان و دواتر ئەندامی ئەنجومەنی وانەبێژی کۆلێژی زانستە کارگێڕییەکان (کۆلێژی بازرگانی جاران)ی زانکۆی شا سعوود (زانکۆی ریازی جاران) و سەرۆکی بەشی زانستە سیاسییەکان بووە.

* یەکێکە لە دامەزرێنەرانی یەکێتیی خوێندکارانی موسڵمانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و کەنەدا و یەکێتیی ئیسلامیی ڕێکخراوە خوێندکارییەکان و کۆمەڵەی زانا کۆمەڵناسە موسڵمانەکانی ویلایە یەکگرتووەکان و کەنەدا و نەدوەی جیهانی لاوانی موسڵمان لە شانشینی عەرەبستانی سعودی و پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی لە ویلایە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

* سکرتێری گشتیی دامەزرێنەری سکرتاریەتی گشتیی نەدوەی جیهانیی لاوانی موسڵمان لە ریاز، یەکەمین سەرۆکی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی،

بەڕێوەبــەری پێــشووی پــەیمانگای جیهــانیی فیکــری ئیــسلامیی و ســەرۆکی ئەنجومەنی راوێژکاری قوتابخانەکانی (منارات الرياض) تـا سـاڵی ١٩٧٤، سـەرۆکی دامەزراوەی گەشەپێدانی منداڵان و دامەزرێنەر و سەرۆکی پێشووی کۆمەڵـەی زانـا کۆمەڵناسە موسڵمانەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کەنەدا.

* بەڕێوەبەر و دامەزرێنەری زانکۆی ئیـسلامیی جیهـانیی لـە مالیزیـا ١٩٨٨ – ١٩٩٩.

* ژمارەیەك کتێب و باسی زانستی سەبارەت بە تیـۆریزەکردنی ئیـسلامییانەی ریفۆرم و گۆرانکاری ناو ئوممەت و تازەکردنەوەی هزری ئیسلامیی نووسیوە.

لە دانراوەکانی:

١ـ بیردۆزە ئابوورییەکانی ئیسلام: فەلسەفە و میکانیزمی هاوچەرخ، ١٩٦٠.

٢ـ بیردۆزە ئیسلامییەکانی پەیوەندییـە نێودەوڵەتـەکان: ئاراسـتەگەلێکی نـوێ بۆ هزر و میتۆلۆژیای ئیسلامیی، ١٩٧٣.

٣ـ قەیرانی عەقڵی موسڵمان، ١٩٨٦.

٤ـ لێدانی ئافرەت وەك چارەسەرێك بۆ کێشەکانی ژن و مێرد، ٢٠٠٢.

٥ـ منداڵی، رەهەندی ون لە پرۆژەی ریفۆرمی ئوممەت، ٢٠٠٣.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیری سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خالانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێروانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاراستەکردنی کاروانی ژیاری مرۆڤایەتی و بەرچاورۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

– هاوکاریی هەولۆ کۆششی زانا توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

– ئاراستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکر و مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لەڕێگەیانەوە کارو چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش هەیە.